بەشی ٢

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**ئاگاداربە!**

- هەموو ناوەڕۆکەکە بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت لە پرسیار.
- وەڵامەکانت ساغبکەوە.

**وەڵامی گونجاو دەوربدە لە ڕاهێنانەکانی ١ تا ١١.**

١ ڕۆژی پێنجشەم ٥٩٦ کەس سەردانی بازاریان کرد ٢٤٦ کەس لە ڕۆژی هەینی. چەند کەس سەردانی بازاڕەکەیان کردووە؟

أ ٧٤٢ ج ٨٤٢
ب ٨٣٢ د هیچ لەوانە

٢ کام ژمارە بچووکترە لە ٥٦٢ ٤؟

أ ٥٦٥ ٤ ج ٥٧٢ ٤
ب ٥٦٠ ٢ د ٦٢٥ ٤

٣ بچووکترین ژمارە کامەیە؟

أ ١٩٨ ١ ج ٥٢٧ ١
ب ٥٧١ ٢ د ١٢٣ ٤

٤ سەرجەمی ٦٣٧ و ٢٩٥ کامەیە؟

أ ٨٢٢ ب ٨٣٢ ج ٩٣١ د ٩٣٢

٥ کام سەرجەم دەکاتە ٣٠٠ بەنزیکی؟

أ ١٤٤ + ٦٦ ج ١٢٧ + ٨٨
ب ١٧٥ + ١٢٣ د ١٣٤ + ١١٦

٦ دوو ژمارە سەرجەمیان ٥٤ و جیاوازیان ٨. ئەم ژماران چین؟

أ ٢٠ و ٣٤ ب ٢٣ و ٣١ ج ٢٤ و ٣٢ د ٥٠ و ٤

٧ دەوەن ٢٣ تۆپی سوور و ٤٦ تۆپی سەوز و ٣٤ تۆپی شین لە تورەکەیەك دانا. چەند تۆپی لە تورەکەکە داناوە؟

أ ١٠٣ ب ١٠٤ ج ١٠٧ د ١١٣

٨ ژمارەیەکی جووت لە نێوان ١٠ و ٢٠، و جیاوازی نێوان دوو ڕەنووسییەکەی دەکاتە ٥. ئەو ژمارەیە کامەیە؟؟

أ ١٤ ب ١٥ ج ١٦ د ٢٧

٩ کام دوو ژمارە جیاوازی نێوانیان دەکاتە ٥٠٠ بە نزیکی؟

أ ٦٤٧ وَ ٣٧٤ ج ٧٨٢ وَ ٣٦٧
ب ٥٢١ و ١١٠ د ٦٥٩ و ١٨٨

١٠ ٥٢٨ − ٢٦٥ = ▢

أ ٢٦٣ ب ٣٦٣ ج ٣٤٣ د ٧٩٣

١١ نزیککراوەی ٤٦١٢ بۆ نزیکترین ١٠٠٠ کامەیە؟

أ ٣٠٠٠ ب ٤٠٠٠ ج ٥٠٠٠ د ٦٠٠٠

**ئەوەی دەیزانی بینووسە**

١٢ ٩٢−٣٨ بە هزری هەژماربکە ڕێگاکەت ڕاقەبکە.

١٣ چۆن ١٦ و ١٨ و ١٤ بە هزری کۆدەکەیتەوە؟

بەشی ٣

# کات و دراو (پارە) و چارەسەرکردنی پێدراوەکان

بونەوەرە زیندووەکان بە خێرایی جیاواز لە یەکتر گەشە دەکەن.
ماوەی گەشە کردنیان دەگۆڕێت بە گۆڕانی چەند هۆکارێك وەك گەرمی وخاك و رووناکی.

**پرسیار بۆ شیکارکردن** بڕوانە خشتەی بەرامبەر.
کام گوڵ خێراترە لە دەرکردنی گەڵاکانی؟
کامیان هێدی ترە لە کرانەوەی گوڵەکان.

**گەشەی گوڵەکان**

| گوڵ | ژمارەی ڕۆژەکانی دەرچوونی گەڵا | ژمارەی ڕۆژەکانی بۆ گەشەکردنی گوڵ |
|---|---|---|
| سەوسەن | نێوان ١٠ و ١٥ | نێوان ٦٠ و٩٠ |
| دەمەشێر | نێوان ٨ و ١٤ | نێوان ٥٥ و ١٠٠ |
| گولەبەرۆژە | نێوان ١٠ ، ١٨ | ١٢٠ |
| باتونیا | نێوان ٤ و ١٠ | نێوان ٤٥ و ٨٠ |
| قەدیفە | نێوان ٧ و ١٨ | ٧٠ |
| گولە نیسان | نێوان ١٤ و ٢١ | نێوان ١٨٠ و ٢٠٠ |



# زانیارییەكانت ساغبكەوە



ئەم لاپەڕەیە بەكاربهێنە بۆ دڵنیابوون لە هەبوونی
ئەم زانیارییانەی كەوا پێویستە لەم بەشەدا

## زاراوەكان

**دەربڕینێكی گونجاو لە لیستی بەرامبەر هەڵبژێرە.**

| |
|---|
| میلی كاتژمێر |
| میلی خولەكژمێر |

١ میلی بچووكی كاتژمێر پێی دەوترێت ___؟___ .

٢ میلی گەورەی كاتژمێر پێی دەوترێت ___؟___ .

## ژماردن بە بازدان

**ماردین هێڵی ژمارەكانی بەكارهێنا بۆ ژماردن بە بەزدان. پێنج پێنج بە ٧ دەستیپێكرد.**




٣ پاش بازدانی هەشتەم دەكاتە چ ژمارەیەك؟

٤ ئایا ٢٥ بریتییە لە یەكێك لەو ژمارانەی پێیدەگات لە بازدانەكەیدا؟

**ماردین هەڵسا بە بازدان بۆ پاش «دواوە» پێنج پێنج بە ٣٧ دەستیپێكرد.**




٥ پاش بازدانی شەشەم دەكاتە چ ژمارەیەك؟

٦ ئایا ١٥ بریتییە لە یەكێك لەو ژمارانەی پێیدەگات لە بازدانەكەیدا؟

## خوێندنەوەی كاتژمێر

**كات چەندە؟**

٧



٨



٩



## ڕۆژەكانی هەفتە

١٠ چەند ڕۆژ لە هەفتەیەكدا هەیە؟

١١ چەند ڕۆژ لە دوو هەفتەدا هەیە؟

١٢ چەند ڕۆژ لە ٣ هەفتەدا هەیە؟

١٣ ناوی ئەو ڕۆژەی پاش شەممە دێت چییە؟

١٤ ناوی ئەو ڕۆژەی پاش سێشەممە دێت چییە؟

١٥ ناوی ئەو ڕۆژەی پێش چوارشەممە دێت چییە؟

وانەی ١

# خوێندنەوەی کاتژمێر

**پێداچوونەوەی خێرا**

لەگەڵ هەر ژمارەیەک ٥ کۆبکەوە

١ ٢٥  ٢ ١٠

٣ ١٥  ٤ ٣٠

**زاراوەکان**

خولەک

**کەرستەکان** کاتژمێری میلدار

## فێربە

لە ڕووی هەر کاتژمێرێک نیشانە و ژمارە و دوو میل هەیە. میلی بچووک و گەورە. هەموو ئەوانە یارمەتی خوێندنەوەی کات دەدەن.





لەیەک **خولەک**، میلی خولەکژمێر لە نیشانەیەک بۆ نیشانەی دوای خۆی دەجولێت لەسەر ڕووی کاتژمێرەکە.

لە ٥ خولەک، میلی خولەکژمێر دەجولێ لە ژمارەیەک بۆ ژمارەی دوای خۆی لەسەر ڕووی کاتژمێر.




لەیەک کاتژمێر میلی کاتژمێر لە ژمارەیەک بۆ ژمارەی دوای خۆی دەجولێت

یەک کاتژمێر ٦٠ خولەکە

بۆ ئەوەی کاتژمێر بخوێنیتەوە، یەکەم جار سەیری ئەو ژمارەیە بکە کە میلی کاتژمێر دیار دەکات (لەوێنەی بەرامبەر) لە دواییدا خولەکەکان بژمێرە بەدەست پێکردن لە ١٢. خولەکەکان پێنج پێنج بژمێرە، پاشان یەک خولەک یەک خولەک بژمێرە تا ئەو شوێنەی میلی خولەکژمێر دیاری دەکات (٢٦ لە وێنەی بەرامبەر).

٥ خولەک
١٠ خولەک
١٥ خولەک
٢٠ خولەک
٢٥ خولەک
٢٦ خولەک

بخوێنە: نۆ و ٢٦ خولەک    بنووسە: ٩:٢٦

- میلەکانی کاتژمێر بجولێنە تا ٧:٤٢ و ٩:٠٧ دیاربکات.

## هەوڵبدە

کاتژمێری ڕەنووسدار بخوێنەوە، لەهەر بارێک بنووسە.

ج




د




میلەکانی کاتژمێر بجولێنە بۆ ئەوەی کات دیاری بکەیت.پاشان کاتژمێری میلدار بخوێنەوە.

أ



ب





## بەیەك ببەستەوە

كاتێك میلی كاتژمێر ژمارەیەك دیار دەكات زیاتر لە ٣٠ خولەك، دەتوانیت كاتژمێرەكە بخوێنیتەوە بە گوتنی ژمارەی خولەكەكانی ماوە، بۆ گەیشتن بە كاتژمێری لە دوای دێت.




**بخوێنەوە:** ١٨ خولەكی دەوێت بۆ دوو لە جیاتی یەك و ٤٢ خولەك

**بنووسە:** ١:٤٢

## ڕاهێنان و شیكاركردنی پرسیارەكان

كاتژمێر بخوێنەوە و كات بنووسە.

١



٢



كاتژمێری میلدار بەكاربهێنە وە میلەكان بجولێنە تا كاتی دیاریكراو دیاردەكات، كاتژمێر بخوێنەوە بە گوتنی ژمارەی خولەكەكانی ماوە بۆ كاتژمێری دواى.

٣




٤




٥ **ڕێنوێنی** ئایا پاك كردنەوەی ددانەكانت خولەكێك یان ٥ خولەك دەخایەنێ؟ ئایا ئامادەكردنی نانی بەیانی خولەكێك یان ٥ خولەك دەخایەنێ؟

## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

٦ كات چەندە؟



| | |
|---|---|
| أ ٣:٤٠ | ب ٧:١٨ |
| ج ٣:٣٨ | د ٤:١٥ |

وانەی
٢

# ئەژمێرکردنی کات

## پێداچوونەوەی خێرا

کات بنووسە دوای دوو کاتژمێر

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١ | ١:٠٠ | ٢ | ٣:١٥ |
| ٣ | ٨:٥٥ | ٤ | ١١:٢٥ |

## زاراوەکان

ماوە

**کەرستەکان** کاتژمێری میلدار

## فێربە

باخان لە کاتژمێر ٨:١٥ تا کاتژمێر ٨:٤٥ پەرتووکەکەی خوێندەوە.
چەند خولەکی خوێندەوە؟






| سەرەتا | ژمارەی خولەکەکان |
|---|---|
| ٨:١٥ | ٣٠ خولەك |

کەواتە باخان ماوەی ٣٠ خولەك پەرتووکی خوێندەوە.

**ماوە «دەم»** ئەو برە کاتەیە لە نێوان سەرەتای چالاکی و کۆتاییەکەی.

- کاتی نێوان ١:١٥ و ١:٤٥ چەندە؟




## هەوڵبدە

کاتژمێری میلدار بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی کات.

أ لە ٩:١٥ تا ١٠:٠٠ ‏ ‏ ب لە ٣:٤٥ تا ٤:٣٠

ج لە ١٠:٠٠ تا ١١:١٥ ‏ ‏ د لە ١١:٤٥ تا ١٢:١٥

هـ لە ٥:١٠ تا ٥:٢٠ ‏ ‏ و لە ٩:٥٥ تا ١٠:٣٥

### پ.ن وە د.ن

باوکی گۆڤان لە ماڵی خۆی لە دهۆك لە کاتژمێر ٨:٠٠ بەیانی بەڕێ کەوت بەرەو کەرکوك گەشتەکەی ٥ کاتژمێری خایاند، کاتژمێر چەند گەیشتە کەرکوك؟






دەرکەوتن ٨:٠٠



ماوە ٥ کاتژمێر

کاتی گەیشتن کاتژمێر ١:٠٠ پاش کاتژمێر ١٢:٠٠. دەڵێن کاتژمێر ١:٠٠ دوای نیوەڕۆ وە دەنوسین ١:٠٠ د.ن.
کاتژمێرەکان نێوان نیوەڕۆ و نیوەشەو بریتییە لە کاتەکانی دوای «پاش» نیوەڕۆ یان د.ن.
کاتژمێرەکانی نێوان نیوەشەو و نیوەڕۆ بریتییە لە کاتەکانی بەری «پێش» نیوەڕۆ یان پ.ن.

• سێ چالاکی بڵێ کە لە کاتژمێرەکانی پ.ن پێی هەڵدەستیت.
• کاتژمێر ٩:٠٠ پ.ن لە کوێ دەبیت. و کاتژمێر ٩:٠٠ د.ن لە کوێ دەبیت.



**نموونە:** هەڤاڵ لە کاتژمێر ١١:٣٠ پ.ن تا کاتژمێر ١٢:١٥ د.ن یاری کرد. ئەو ماوەیەی یاری کرد چەندە؟

سەرەتا ١١:٣٠



ژمارەی خولەکەکان ٤٥ خولەك



## بەیەك ببەستەوە

وانەکان لە کاتژمێر ٨:٠٠ پ.ن دەست پێ دەکات و ٤ کاتژمێر و ٢٥ خولەك دەخایەنێت. لە چ کاتێك وانەکان کۆتاییان دێت؟

سەرەتا ٨:٠٠



کاتژمێرەکان بژمێرە



پاشان خولەکەکان بژمێرە



وە هەروەها، وانەکان لە کاتژمێر ١٢:٢٥ د.ن کۆتاییان دێت.

**لەبیرمەکە** ئەگەر زانیت چالاکی لە چ کاتێك دەست پێ دەکات و ماوەکەی چەندە؟ دەتوانی بزانی لە چ کاتێك کۆتایی دێت.

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

**کاتژمێری میلدار بەکاربێنە بۆ ئەژمێرکردنی ماوەی کاتەکان.**

١ لە ٧:٠٠ پ.ن تا ٧:٤٥ پ.ن

٢ لە ٥:١٥ د.ن تا ٦:٢٠ د.ن

٣ لە ١١:١٥ پ.ن تا ١٢:٣٠ د.ن

٤ یاری تۆپی باڵە لە کاتژمێر ١٠:٣٠ دست پێدەکات، وە کۆتایی دێت لە کاتژمێر ١٢:١٥. یارییەکە چەندی خایاند؟

٥ **بەرەنگار** کاتژمێری میلدار بەکاربێنە بۆ نزیککردنەوەی ٨:٢٥ بۆ نزیکترین نیو کاتژمێر.

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

٦ گەشتەکە لە کاتژمێری ٦:٢٥ د.ن دەستپێکرد و ٥٠ خولەکیش بەردەوام بوو. گەشتەکە لە چ کاتێکدا تەواوبوو؟

أ ٥:٣٥ د.ن ب ٦:٠٠ د.ن ج ٧:١٥ د.ن د ٧:١٠ دن

وانەی ٣

# دراوەکان

## فێربە

هاوڵاتی چەند جۆرێك لە دراو بەکاردەهێنێت.
















کاتێك لە بازار دەبیت پێویستیت بە ژماردنی دراو دەبێت بۆ ئەوەی بیدەی بە فرۆشیارێك یان ئەوەی فرۆشیارەکە بۆت دەگەڕێنێتەوە.

لەبەرکردنی ئەم ڕاستیانەی خوارەوە یارمەتیت دەدات بۆ ژماردنی پارە «دراو» بە خێرایی و دوورکەوتنەوە لە هەڵەکردن.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٥٠ | + | ٥٠ | = | ١٠٠ |
| ٢٥٠ | + | ٢٥٠ | = | ٥٠٠ |
| ٥٠٠ | + | ٥٠٠ | = | ١ ٠٠٠ |
| ٥ ٠٠٠ | + | ٥ ٠٠٠ | = | ١٠ ٠٠٠ |
| ٢٥ ٠٠٠ | + | ٢٥ ٠٠٠ | = | ٥٠ ٠٠٠ |

یان

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٢ | × | ٥٠ | = | ١٠٠ |
| ٢ | × | ٢٥٠ | = | ٥٠٠ |
| ٢ | × | ٥٠٠ | = | ١ ٠٠٠ |
| ٢ | × | ٥٠٠٠ | = | ١٠ ٠٠٠ |
| ٢ | × | ٢٥ ٠٠٠ | = | ٥٠ ٠٠٠ |

### نموونە

أ بەهای کوژمەیەك چەندە کە پێکهاتووە لە ٣ پارچەی ٢٥٠ دیناری؟

سەرنج بدە ٢٥٠ + ٢٥٠ = ٥٠٠

وە ٥٠٠ + ٢٥٠ = ٧٥٠

کەواتە ٢٥٠ + ٢٥٠ + ٢٥٠ = ٧٥٠

بۆیە بەهای کوژمەکە دەکاتە ٧٥٠ دینار

ب چ پارچە دراوێك بەکاردەهێنیت بۆ ئەوەی ١٧٥٠ دینار پێکبهێنیت؟

سەرنج بدە ١٠٠٠ + ٥٠٠ = ١٥٠٠

وە ١٥٠٠ + ٢٥٠ = ١٧٥٠

کەواتە پارچەیەکی ١٠٠٠ دیناری و پارچەیەکی ٥٠٠ دیناری و پارچەیەکی ٢٥٠ دیناری بەکاردەهێنم.

## بەیەك ببەستەوە

بەهای هەر کوژمەیەك بدۆزەوە.

١ ٤ [٢٥٠]
٢ ٤ [٥ ٠٠٠]
٣ ٦ [٥٠٠]
٤ ٣ [١ ٠٠٠]
٥ ٧ [٢٥٠]
٦ ٣ [٢٥ ٠٠٠]

٧ ٦ پارچەی ٢٥٠ دیناری.

٨ ٥ پارچەی ٥٠٠ دیناری.

٩ ٤ پارچەی ١ ٠٠٠ دیناری و یەك پارچەی ٢٥٠ دیناری.

١٠ ٤ پارچەی ٥٠٠ دیناری و پارچەیەکی ٢٥٠ دیناری.

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

بەهای هەر کوژمەیەك بدۆزەوە.

١١ ١٠ پارچەی ٥٠٠ دیناری.

١٢ ١٠ پارچەی ٢٥٠ دیناری.

١٣ ٨ پارچەی ٥٠٠ دیناری و پارچەیەکی ٢٥٠ دیناری.

١٤ ٤ پارچەی ٥ ٠٠٠ دیناری و پارچەیەکی ٢٥ ٠٠٠ دیناری.

١٥ کەمترین پارچە دراو بەکاردەهێنرێت بۆ پێکهێنانی کوژمەی ٢٢٥٠ دینار چەندە؟

١٦ چەند پارچە ٢٥٠ دیناریت پێویستە بۆ پێکهێنانی ١ ٠٠٠ دینار؟

١٧ باوکت ٣ پارچە ٥٠٠ دیناری و ٤ پارچە ١ ٠٠٠ دیناری پێدای. سەرجەمی ئەوەی پێیداوی چەندە؟

١٨ کام کوژمە هاوتای ١٠ پارچە ٥٠٠ دیناری و دوو پارچە ١٠ ٠٠٠ دیناری و پارچەیەکی ٢٥٠ دیناریە؟

أ ٢٥ ٧٥٠ دینار.　　ب ٢٥ ٢٥٠ دینار.

ج ٢٥ ٥٠٠ دینار.　　د ٢٦ ٠٠٠ دینار.

١٩ جانتایەکی پێنووست کڕی بە ٤ ٥٠٠ دینار وە ٣ تێنووست کڕی نرخی هەر یەکەی ١ ٢٥٠ دینار، پارچەیەکی ٢٥ ٠٠٠ دیناریت دا بە فرۆشیارەکە، چەندی بۆت گەڕاندەوە؟

٢٠ سارا کوژمەیەکی پاشەکەوت کرد پێکهاتبوو لە ٣ پارچە ٥ ٠٠٠ دیناری و دوو پارچە ١ ٠٠٠ دیناری و ٦ پارچە ٥٠٠ دیناری و ٤ پارچە ٢٥٠ دیناری ویستی کەراسێك و پێلاوێك بکڕێت نرخەکانیان پێکەوە ٢٠ ٠٠٠ دینار بوو، ئایا ئەوەی پاشەکەوتی کردبوو بەشی دەکات؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

٢١ باوکی سازان بۆ سازدانی ئاهەنگێك بە بەهای ١٧٩ هەزار دینار برنجی کڕی. گۆشتی بە بەهای ١٣٩ هەزار دینار کڕی، میوەو سەوزی بە بەهای ٨٥ هەزار کڕی، ٥٠٠ هەزار دیناری پێبوو. چەند هەزار دیناری پێماوە؟

أ ٤٠٣　　ب ١٨٢　　ج ١٩٧　　د ٩٧

وانەی
٤

# کارامەیی لە شیکارکردنی پرسیارەکان

## بەکارهێنانی ڕۆژمێر



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ١٧ − ٩ = ☐

٢ ٢ + ١٤ = ☐

٣ ٣١ − ١١ = ☐

٤ دووهەفتە = ☐ ڕۆژ

تێبگە | پلاندانێ | شیکاربکە | ساغبکەوە

**کەشت** باوکی بەفرین پلان دادەنێ بۆ گەشتێك بۆ دەرەوەی وڵات، ئامادەبوون بۆ گەشتەکە، ئەوکارانەی کە پێی هەڵدستێ تۆماری کرد. سەیری تۆمارکراوەکانی باوکی بەفرین بکە. یارمەتی بدە یەکەمجار چی بکات

| تشرینی دووەم ٢٠١٤ | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| شەممە | ١شەممە | ٢شەممە | ٣شەممە | ٤شەممە | ٥شەممە | هەینی |
| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ |
| ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ |
| ١٥ | ١٦ | ١٧ | ١٨ | ١٩ | ٢٠ | ٢١ |
| ٢٢ | ٢٣ | ٢٤ | ٢٥ | ٢٦ | ٢٧ | ٢٨ |
| ٢٩ | ٣٠ | | | | | |

| کانوونی یەکەم ٢٠١٤ | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| شەممە | ١شەممە | ٢شەممە | ٣شەممە | ٤شەممە | ٥شەممە | هەینی |
| | | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
| ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ |
| ١٣ | ١٤ | ١٥ | ١٦ | ١٧ | ١٨ | ١٩ |
| ٢٠ | ٢١ | ٢٢ | ٢٣ | ٢٤ | ٢٥ | ٢٦ |
| ٢٧ | ٢٨ | ٢٩ | ٣٠ | ٣١ | | |

ئەوەی پێویستە پێی هەڵستی

بەرواری ئەمرۆ: ٢٦ تشرینی دووەم
بەرواری گەشت: ٢٢ی کانوونی یەکەم

پێویستە لەسەرم

- پێویستەکان دەکرم پێش دە ڕۆژ.
- ئۆتۆمبێل دەگرم پاش حەفتەیەك لەم ڕۆژەدا.
- ئۆتێل دابین دەکەم پێش دوو حەفتە لە گەشت.

**ڕۆژمێر بەکاردێنم بۆ دابینکردنی بەرواری هەر کارێك**

دیارکردنی بەرواری کڕینی پێداویستی گەشت
سەرەتا: ٢٢ی کانوونی یەکەم
١٠ ڕۆژ بگەڕێوە بۆ دواوە بەرواری کڕینی پێداویستی: ١٢ی کانوونی یەکەم

دیارکردنی بەرواری بە کرێ گرتنی ئۆتۆمبیل.
سەرەتا: ٢٦ تشرینی دووەم
٧ ڕۆژ بۆ پێشەوە بژمێرە بەرواری بەکرێ گرتنی ئۆتۆمبێل: ٣ کانوونی یەکەم

دیارکردنی بەرواری دابین کردنی ئۆتێل
سەرەتا: ٢٢ی کانوونی یەکەم
دوو حەفتە بۆ دواوە بژمێرە
بەرواری دابین کردنی ئۆتێل: ٨ کانوونی یەکەم.

**ئەوەی پێی هەڵدەستی بەڕیز بنووسە.**

| ئەوەی پێی هەڵدەستی | بەروار |
|---|---|
| بەکرێ گرتنی ئۆتۆمبێل | ٣ی کانوونی یەکەم |
| دابینکردنی ئۆتێل | ٨ی کانوونی یەکەم |
| کڕینی پێداویستی | ١٢ی کانوونی یەکەم |

کەواتە، باوکی بەفرین دەبێت لە پێشا ئۆتۆمبێل بەکرێ بگرێ.

**باسبکە**

- بەرواری ئەو ڕۆژەی دەکەوێتە پاش ٣ هەفتە لەم ڕۆژە؟

## ڕاهێنـــان و شیـکـارکـردنـی پـرسیـارەکـان

**لیست و ڕۆژمێر بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی پرسیارەکانی ١ تا ٤.**

| ئاب ٢٠١٥ | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| شەممە | ١شەممە | ٢شەممە | ٣شەممە | ٤شەممە | ٥شەممە | هەینی |
| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ |
| ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ |
| ١٥ | ١٦ | ١٧ | ١٨ | ١٩ | ٢٠ | ٢١ |
| ٢٢ | ٢٣ | ٢٤ | ٢٥ | ٢٦ | ٢٧ | ٢٨ |
| ٢٩ | ٣٠ | ٣١ | | | | |

| ئەیلول ٢٠١٥ | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| شەممە | ١شەممە | ٢شەممە | ٣شەممە | ٤شەممە | ٥شەممە | هەینی |
| | | | ١ | ٢ | ٣ | ٤ |
| ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ |
| ١٢ | ١٣ | ١٤ | ١٥ | ١٦ | ١٧ | ١٨ |
| ١٩ | ٢٠ | ٢١ | ٢٢ | ٢٣ | ٢٤ | ٢٥ |
| ٢٦ | ٢٧ | ٢٨ | ٢٩ | ٣٠ | | |

ئەوەی پێویستە پێی هەڵستی

بەرواری ئەمڕۆ: ٢٥ ئاب

بەرواری ئاهەنگ: ١٦ ئەیلول

پێویستە لەسەرم:

- مێز و کورسی بە کرێ بگرم پێش ئاهەنگ بە دوو هەفتە.
- کارتی داوەت دەنێرم پاش ٥ ڕۆژ لەم ڕۆژەدا.
- داوەت قالبی شیرینی دەکەم پاش ١٠ ڕۆژ لە ناردنی داخوازی.

**١** ئەو کارانەی پێوستە بیکەی بەڕیز بنووسە، بە دیاریکردنی بەرواری هەرکارێك.

**٢** وا دابنێ بەرواری ئاهەنگی ١١ی ئەیلولە ئەو کارانەی پێویستە بیکەی بەڕیز بنووسە، بە دیاریکردنی بەرواری هەر کارێك.

**قوتابیانی پۆلی سێیەم هەڵدەستن بە سەردان بۆ مۆزەخانەی مێژوو لە ٥ی ئاب، وە بۆ مۆزەخانەی هونەری ئیسلامی لە ٩ی ئەیلول بۆ مۆزەخانەی زانستی لە ٢٦ی ئاب.**

**٣** لەمانەی دێت کام ریزبەندی ڕاستە بۆ سەردانەکان؟

أ زانست ، مێژوو ، هونەر

ب مێژوو ، زانست ، هونەر

ج زانست ، هونەر ، مێژوو

د مێژوو ، هونەر ، زانست

**٤** ژمارەی ڕۆژەکانی نێوان ڕۆیشتن بۆ مۆزەخانەی مێژوو وە ڕۆیشتن بۆ مۆزەخانەی زانست چەندە؟

أ ١٤ ڕۆژ

ب ٢٠ ڕۆژ

ج ٣١ ڕۆژ

د ٣٥ ڕۆژ

## ڕاهێنان بە چەند ڕێگەیەکی جیاواز

**٥** جەژنی ڕەمەزان لە ڕێکەوتی ٢٨ تەمووز بوو، پاش دوو مانگ و ١٠ ڕۆژ جەژنی قوربان دێت، ئایا جەژنی قوربان دەکەوێتە مانگی ئەیلول یان تشرینی یەکەم؟

**٦** ئاراس لە ئاهەنگی دەرچوونی پێویستی بە ٨ کورسی بۆ گەورەو ١٤ کورسی بۆ بچووکەکان هەیە، ئایا ئاراس ئەو کورسیانەی پێوسیتیەتی دەتوانێ بیان خەملێنێ؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەوە.



## پێداچوونەوەی خێرا

١) ٣٧ + ٢٦ = 
٢) ٨٥ − ١٤ = 
٣) ٥٦ + ١٩ = 
٤) ٢٨ − ١٩ = 

# وێنەدار

ژماردن بە وێنە وێنەدار هۆیەکە بۆ نیشاندانی زانیارییەکان، تیایدا وێنە بەکاردێت کە گوزارشت لە ژمارە دەکات.
لە وێنەداری بەرامبەر، هەر گوزارشت دەکات لە یەك قوتابی. بریتییە لە هێمای ئەو وێنەدارە.
دەتوانیت ئەمانە بژمێریت بۆ ئەوەی ژمارەی قوتابیان بدۆزیتەوە لەهەر چەشنێك.

| هۆکاری چوون بۆ قوتابخانە | |
|---|---|
| بەپێ | |
| بە پاسکیل | |
| بە ئۆتۆمبێل | |
| بە پاس | |

- چەند قوتابی بە پاس دەڕوات بۆ قوتابخانە؟

سەیری ریزی پاس بکە.
لەوێ ٧ دەبینیت.
∴ ٧ قوتابی بە پاس دەڕۆن بۆ قوتابخانە.



هەندێ جار هەر هێمایەك گوزارشت دەکات لە زیاتر لە یەك کەس، سەیری وێنەداری خوارەوە بکە.
لە خوارەوە دیارە دەستەواژەی: = ٣ مێروو
ئەم دەستەواژەیە کلیلی وێنەدارەکەیە.
لەم کلیلە واتە هەر یەك لە بریتییە لە ٣ مێروو.

| ژمارەی مێرووەکان لە تاقیگە | |
|---|---|
| مێش | |
| مێشوولە | |
| دووپشك | |
| مێروولە | |

= ٣ مێروو

- چەند دووپشك لە تاقیگەدا هەیە؟

لە ریزی دووپشك ١ هەیە، هەر بریتییە لە ٣.
کەواتە، ژمارەی دووپشکەکان ٣ یە.

- چەند مێش لە تاقیگەدا هەیە؟

لە ریزی مێش ٣ هەیە، هەر بریتییە لە٣.
کەواتە، ژمارەی مێشەکان: ٣ + ٣ + ٣ = ٩

## ساغ بکەوە

خەسرەو ڕاهێنان دەکات ٣ ڕۆژ لە هەفتەیەکدا بۆ بەرزکردنەوەی قورسایی. وێنەداری بەرامبەر ژمارەی بەرزکردنەوەکانی لە هەفتەی یەکەم پیشاندەدات.

- چەند بەرزکردنەوەی ئەنجامداوە لە ڕۆژی چوارشەممەدا؟
- چەند بەرزکردنەوەی لە ڕۆژی شەممەدا زیاتر ئەنجامداوە لە ڕۆژی چوارشەممە؟
- ئەگەر کلیلی = ٥ بەرزکردنەوە، چەند بەرزکردنەوەی ئەنجامداوە ڕۆژی چوارشەممە؟

**ژمارەی بەرزدکردنەوەکانی خەسرەو لە هەفتەی یەکەم**

| | |
|---|---|
| چوارشەممە | 🏋 🏋 |
| پێنجشەممە | 🏋 🏋 🏋 |
| شەممە | 🏋 🏋 🏋 🏋 |

🏋 = ١٠ بەرزکردنەوە

## ڕاهێنــان و شیـکارکـردنـی پـرسـیـارەکـان

**وێنەداری بەرامبەر بەکاربهێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانی ١ تا ٥.**

**ژمارەی گیاندارە گوربەییەکان لە باخچەی ئاژەڵان**

| | |
|---|---|
| پڵنگ | 🐈 🐈 |
| یۆز | 🐈 🐈 🐈 |
| جاگوار | 🐈 |
| شێر | 🐈 🐈 🐈 🐈 |

🐈 = ٣ گیاندەرە گوربەییەکان «سنوریات»

١ چەند پڵنگ لە باخچەی ئاژەڵاندا هەیە؟

٢ چەند شێر؟

٣ جیاوازی نێوان ژمارەی شێرەکان و ژمارەی یۆزەکان چەندە؟

٤ ژمارەی هەموو گیاندارەکان لە باخچەی ئاژەڵان چەندە؟

٥ ئەگەر کلیل لەم وێنەدارە 🐈 = ٥ گیانداربێت؟ ژمارەی هەموو گیاندارەکان بە بێ شێرەکان چەندە؟

٦ باوان خولیای بەخێوکردنی ئاژەڵە ماڵییەکانە لە باخچەکەی. ٤ پشیلەو ١٢ مریشك و ٤ مراوی و ٨ کەروێشکی هەیە. وێنەدارێك وێنەبکێشە ئەم پێدراوانە بنوێنێت. ناوێکی گونجاو و کلیلێکی گونجاوی بۆ هەڵبژێرە.

٧ **ڕێنوێنی** وێنەدارێك ٤٢ توخم دەنوێنێت، کلیلەکەی ☐ = ٦ توخم. چی ڕوودەدات لە ژمارەی ☐ لەهەر ڕیزێك ئەگەر کلیل گۆڕا بۆ ☐ = ٣ توخم؟

## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

٨ کام پارك زیاتر لە ٥٠ ئۆتۆمبیلی تێدایە؟

أ ١    ب ٢

ج ٣    د ٤



وانەی ٦

بەدەستی

# کۆکردنەوەی زانیارییەکان و ڕێکخستنیان



## پێداچوونەوەی خێرا

ژمارەکە بنووسە

١ |||
٢ ||||
٣ |||| ||
٤ |||| |||| |

## زاراوەکان

پێدراو

خشتەی سەرژمێری

خشتەی دووبارەبوونەوە

**کەرستەکان** پێنووس، کاغەز

## فێربە

ئەو زانیارییانەی کە لە باری کەسان وشتان کۆ دەکەیتەوە پێیان دەترێت **پێدراو**.

مامۆستا پرسیاری لە قوتابیەکانی کرد دەربارەی ئەو گیانلەبەرانەی کە خۆشیان دەوێت، دوو خشتەی دروستکرد بۆ دەرخستنی ئەنجامەکان.

لە **خشتەی سەرژمێری** هەندێك هێڵ بۆ تۆمارکردنی پێدراوەکان بەکاردەهێنرێن.

ژمارەکان بۆ تۆماری پێدراوەکان لە **خشتەی دووبارە** بوونەوە بەکاردێت.

**گیانلەبەری پەسند**

| ناو | سەرژمێری |
|---|---|
| ئەسپ | |||| | |
| شێر | |||| || |
| فیل | |||| |||| || |
| مامز(ئاسك) | ||| |

**گیانلەبەری پەسند**

| ناو | دووبارەبوونەوە |
|---|---|
| ئەسپ | ٦ |
| شێر | ٧ |
| فیل | ١٢ |
| مامز(ئاسك) | ٣ |

دەتوانی زانیاری لەسەر ئەو گیانلەبەرانەی کە هاوڕێیەکانت لەپۆل پەسندی دەکەن کۆ بکەیتەوە و ڕێکیان بخەیت لە خشتەی سەرژمێریدا.

## نموونە

**هەنگاوی ١**

خشتەی سەرژمێری دروستبکە لە پاشان (٤) پرسیاری گونجاو دیاری بکە.

**هەنگاوی ٢**

پرسیارێك لەهەر هاوڕێیەك لە هاوڕێیەکانت بکە تا بزانی کام گیانلەبەری لاپەسندە؟ هێڵێك بکێشە لە شوێنی گونجاو بۆ هەر وەڵامێك.

**گیانلەبەری پەسند**

| ناو | سەرژمێری |
|---|---|
| | |
| | |
| | |

• بۆچی خشتەی سەرژمێری گونجاو بۆ تۆمارکردنی پێدراوەکان دروستدەکەی؟



## هەوڵبدە

**پرسیارێك هەڵبژێرە تا لە هاوڕێکانتی بکەی.**

أ ٤ وەڵام بنووسە لە خشتەی سەرژمێری.

ب پرسیار لە هاوڕێکەت بکە و خشتەکە تەواوبکە.

## بەیەك بەستەوە

ئەو پێدراوانەی کە کۆتکردوونەوەو لە خشتەی سەرژمێری پێشوودا تۆمارکردوون بەکاربێنە بۆ دروسکردنی خشتەی دووبارە بوونەوەیی.



### نموونە

**هەنگاوی ١**

ناونیشانی خشتەکە وناو نیشانی هەردوو ستوونەکە بنووسە. لە پاشان هەر چوار وەڵامەکە بنووسە.

**هەنگاوی ٢**

هێڵەکان لەهەر ریزێك لە خشتەی سەرژمێریدا بژمێرە ژمارەی گونجاو لەهەر ریزێك لە خشتەی دووبارە بوونەوە بنووسە.

| گیانلەبەری پەسند | |
|---|---|
| ناو | سەرژمێری |
| | |
| | |
| | |

• خشتەی سەرژمێری گونجاوە بۆ تۆمارکردنی پێدراوەکان بۆچی؟

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

١ ٣ چالاکی هەڵبژێرە لەو چالاکییانەی کە قوتابی دەتوانی لە دوای گەڕانەوەی بۆ ماڵ بیانکات داوا لە هاوڕێکانت بکە یەکێك لەم چالاکییانە هەڵبژێرن.

٢ خشتەیەکی دووبارە بوونەوە دروستبکە بۆ خستنە ڕووی پێدراوە تۆمارکراوەکانی لە خشتەی سەرژمێری بەرامبەر.

٣ کام میوە زیاتر پەسندە؟
کەمتر پەسندە؟

| میوەی پەسند | |
|---|---|
| ناو | ژماردن |
| تری | ||||| ||||| ||||| \| |
| پرتەقاڵ | \|\| |
| سێو | ||||| |
| مۆز | ||||| \|\|\| |

## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

٤ خشتەی بەرامبەر سەرژمێری ئەوانەی کە هەندێ لە ئاژەڵە ماڵیەکانیان خۆشدەوێ پیشاندەدات. کام ئاژەڵ ژمارەیەکی زۆرتر خۆشیاندەوێت؟

أ پشیلە    ج چێڵ

ب سەگ    د ئەسپ

| گیانلەبەری پەسند | |
|---|---|
| پشیلە | ||||| ||||| \|\| |
| سەگ | ||||| ||||| \|\|\|\| |
| چێڵ | ||||| \|\|\|\| |
| ئەسپ | ||||| \|\| |

وانەی ٧

# پۆلێنکردنی پێدراوەکان

**پێداچوونەوەی خێرا**

ئایا هەریەك لەم ژمارانە لە ٣٤٥ گەورەترە یان بچووکترن؟

١ ٢٩٨ ٢ ٤٠٤

٣ ٣٤٤ ٤ ٣٥٤

**زاراوەکان**

پۆلین کردن

## فێربە

**تۆپە جوولاوەکان** دەتوانی پێدراوەکان بە چەند ڕێگایەك پۆلێن بکەی وەك ڕەنگ یان قەبارە یان شێوە، مامۆستای پۆلی سێیەم تورەکەیەك تۆپی ڕەنگاوڕەنگی دایە دوو کۆمەڵە قوتابی، داوای لێکردن بیربکەنەوە بە چ ڕێگەیەك دەتوانن ئەم تۆپانە کۆبکەنەوە و پۆلێنیان بکەن.

پۆلا و زانا ئەم خشتەیان دروستکرد.

**تورەکەی تۆپەکان**

| | بچووك | ناوەنجی | گەورە |
|---|---|---|---|
| شین | ٢ | ٢ | ٥ |
| سوور | ٣ | ١ | ٥ |
| هەمەڕەنگ | ٣ | ٣ | ٢ |

- چۆن پۆلاو زانا پێدراوەکانیان پۆلێن کرد؟

## ساغبکەوە

١ ژمارەی تۆپە بچووکە شینەکان چەندن؟

٢ ژمارەی تۆپە گەورە سوورەکان چەندن؟

٣ ژمارەی تۆپە ناوەنجییەکان چەندن؟

٤ ژمارەی تۆپە گەورەکان چەندی زیاترە لە ژمارەی تۆپە بچووکەکان؟

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

**یارییەکانی زیرەك بریتین لە ژمارەیەك ئۆتۆمبێل و پایسکلی بچووك پێدراوەکانی خشتەی بەرامبەر بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانی ٥ تا ٧.**

٥ ژمارەی پایسکلە سوورەکان چەندن؟

٦ ژمارەی ئۆتۆمبێل وپایسکلی شینەکان چەندن؟

٧ ژمارەی ئۆتۆمبێلەکان وپایسکلەکانی زیرەك چەندن؟

**ئۆتۆمبێلەکان وپایسکلەکانی زیرەك**

| | کەسك | شین | سوور | زەرد |
|---|---|---|---|---|
| ئۆتۆمبێل | ١ | ٦ | ٢ | ٥ |
| پایسکل | ٣ | ٤ | ٤ | ٠ |

**تابلۆكانی هونەری لە پیشانگای شاردا**

| | تەباشیر | تێنووسی دار | ناوی | پەرووچە |
|---|---|---|---|---|
| كەسەكان | ٣ | ٥ | ٨ | ١ |
| گیانلەبەرەكان | ٤ | ٥ | ٤ | ٣ |
| گولەكان | ٦ | ٢ | ٩ | ٥ |

**پێدراوەكانی خشتەی بەرامبەر بەكاربێنە بۆ شیكاركردنی راهێنان ٨ تا ١٠**

**٨** چەند تابلۆ لە پیشانگای شاردا هەیە؟

**٩** لە تابلۆیەكانی پێشانگای شاردا كام بابەت زۆرترین ژمارەی هەیە؟

**١٠** ١٢ چەشنە تابلۆ لە پێشانگای شاردا هەیە كام چەشن كەمترین ژمارەی هەیە؟

**١١** سەیری شێوە ئەندازەییەكانی بەرامبەربكە و خشتەیەك دروستبكە بۆ پۆلێنكردنی ئەم شێوانە.



## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٢** خشتەی بەرامبەر پێدراوەكان لەسەر ئۆتۆمبێلەكانی سازان پیشاندەدات، ژمارەی ئۆتۆمبێلە بچووكەكان چەندن؟

أ ٣٥    ج ٥١

ب ١٨    د ١٩

| | سوور | رەش | شین | زەرد |
|---|---|---|---|---|
| بچووك | ١١ | ٧ | ١٢ | ٥ |
| گەورە | ٣ | ٥ | ٦ | ٢ |

## شیكاركردنی پرسیارەكان

## دەروازەیەك لە خوێندنەوە

### بەكارهێنانی نواندنە روونكردنەوەییەكان

دەتوانیت نواندنە روونكردنەوەییەكان بۆ بەراوردكردنی پێدراوەكان شیكردنەوەیان بەكاربێنیت كاتێ پەنا دەبەیتە بەر نواندنی روونكردنەوەیی تۆ وێنەكە (دەخولێنیەوە)، لە جیاتی خوێندنەوەی وشەكان. سالار راپرسییەكی دەربارەی ئەو كتێبانەی كە هاورێیەكانی لە وەرزی هاویندا خویندویانە نواندنی پێدراوەكانی بە دوو شێوەی روونكردنەوەیی كرد.






أ سالار لە چەند قوتابی پرسی؟

ب چەند قوتابی ٧ كتێبی خوێند؟

ج ئایا قوتابی هەبوو تەنها یەك كتێبی خوێندبێتەوە؟

وانەی
٨

# خوێندنەوەی ستوونە ڕوونکردنەوەییەکان



## پێداچوونەوەی خێرا

١. ٤ × ١٠ = ▢

٢. ٧ × ٧ = ▢

٣. ▢ × ٦ = ٣٦

٤. ٩ × ▢ = ٨١

## زاراوەکان

ستوونەکانی ڕوونکردنەوەیی

پەیژەی ژمارەیی

هەنگاوی پەیژەی ژمارەیی

### فێربە

**ساڵ لە دوای ساڵ** **ستوونەکانی ڕووکردنەوەیی** یەکێکن لە شێوەکانی نواندنی پێدراوەکانی ڕوونکردنەوە. ئەو شێوە ستوونییە بەکاردێت بۆ نواندنی پێدراوەکان. هەروەها **پەیژەی ژمارەیی** بەکاردێت بۆ یارمەتیدان لە خوێندنەوەی ئەو ژمارەی کە هەر ستوونێك دەینوێنێ. ئەو ستوونە ڕوونکردنەوەییەی خوارەوە پێدراوەکانی تەمەنی هەندێ گیانلەبەر دیاردەکات ئەم شێوەیە دوو تەوەرەیە، تەوەرەی ئاسۆیی جۆری ئاژەڵەکان دیاردەکات و تەوەرەی ستوونی ڕەنووسکراوی ساڵەکان دیاردەکات.






بەم ژمارانە دەوترێت پەیژەی ژمارەیی

سفر، ٢، ٤، ٦، ٨، ١٠، ١٢، ١٤، ١٦. لە ژمارەیەکەوە بۆ ژمارەیەکی تر زیادکردنی دوو دوو بەو ژمارانە دەوترێت **هەنگاوی پەیژەی ژمارەیی**.

- ئەو پەیژەییە بەکارهاتووە لە ستوونی ڕوونکردنەوەیی بەرامبەر چییە؟ بۆچی ئەم پەیژەیە باشە؟
- چۆن ژمارەی بەرامبەر بە ستوونی سەگەکە دەخوێنیتەوە؟

### نموونە

أ




ب




- ئەم دوو نواندنە بەچی لە یەك دەچن؟ بەچی جیاوازن؟

## ساغبکەوە

١ بۆق چەند ساڵ دەژی؟

٢ کرم چەند ساڵ دەژی؟

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان




ستوونەکانی ڕوونکردنەوەیی دەربارەی درێژی هەندێ لە ئاژەڵەکانی دەریایی، بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانی ٣ و ٤

٣ درێژی نەهەنگ چەندە؟

٤ درێژی نەهەنگی بۆر چەند زۆرترە لە دۆلفین




ستوونەکانی ڕوونکردنەوەیی بەکاربێنە دەربارەی ئەو ئاژەڵەی کە پەسندی دەکەی بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانی ٥ و٦.

٥ کام ئاژەل زۆرتر پەسندە؟

٦ کام دوو سەرجەم گەورەترە، سەرجەمی ئەوانەی تمساح وشێر پەسنددەکەن یان ئەوانەی فیل وزەڕافە پەسند دەکەن؟



## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

٧ ستوونە ڕوونکردنەوەییەکانی بەرامبەر ژمارەی کەراسەکان پیشاندەدات جمیل فرۆشتویەتی لە میانەی ٥ ڕۆژدا. چەند کەراسی فرۆشتووە لە ڕۆژی سێشەممە؟




أ ٣٠    ج ٢٠

ب ١٠    د ٤٠

## بەشی ٣

# پێداچوونەوە

### دڵنیابوون لە زاراوەکان و چەمکەکان

دەربڕینی گونجاو هەڵبژێرە لە لیستی بەرامبەر.

| |
|---|
| خشتەی ژماردن |
| خشتەی دووبارەبوونەوە |
| ستوونەکانی ڕوونکردنەوەیی |

**١** ـــــ؟ـــــ ئەو خشتەیە کە نیشانەکانی ژماردن بەکاردێنێت بۆ تۆمارکردنی پێدراوەکان.

**٢** ـــــ؟ـــــ ئەو خشتەیە کە ژمارەکان بەکاردێنێت بۆ تۆمارکردنی پێدراوەکان.

### دڵنیابوون لە کارامەییەکان

هێمای > یان < یان = بەکاربێنە بۆ بەراوردکردن.

**٣** ١ لە جۆری ١٠٠٠ دیناری و ٢ لە جۆری ٥٠٠ دیناری ○ ٣ لە جۆری ٢٥٠ دیناری و ١ لە جۆری هەزار دیناری.

**٤**



وانەی وەرزش

**٥**



کاتی نووستن

**٦**



کاتی خواردنی نانی نیوەڕۆ

**٧**




کاتی خواردنی نانی ئێوارە

وێنەداری بەرامبەر بەکاربهێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانی ٨ تا ١٠.

**بالندە ماڵییەکان**

| بالندە | ژمارە |
|---|---|
| بولبول | 🐦🐦🐦🐦 |
| کەناری | 🐦🐦 |
| فیسقەگوڵە | 🐦🐦🐦 |
| تۆوتی | 🐦🐦 |

🐦 = ٢

**٨** ژمارەی فیسقەگوڵەکان چەندە؟

**٩** ژمارەی بولبولەکان چەندی زیاترە لە ژمارەی کەنارییەکان؟

**١٠** ژمارەی هەموو باڵندەکان چەندە؟

خشتەی سەرژمێری بەرامبەر بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانی ١١ و١٣.

**ئامێرە پەسندەکان**

| ئامێری موسیقا | سەرژمێری |
|---|---|
| گیتار | 卌 卌 卌 |
| شمشاڵ | |||| 卌 |
| عود | ||| 卌 卌 卌 |
| پیانۆ | ||| 卌 卌 |

**١١** ناوی ئەو ئامێرانە بڵێ لە زۆرترین باوەوە بۆ کەمترین باو.

**١٢** چەند کەس بەشداری ڕاپرسییەکانی کرد؟

**١٣** خشتەیەکی دووبارە بوونەوە پێکبهێنە بۆ خستنە ڕووی ئەو پێدراوانەی دراون لە خشتەی سەرژمێری بەرامبەر.

ستوونەکانی ڕوونکردنەوەیی بەکاربهێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانی ١٤ و ١٥




**١٤** ژمارەی ئەوانەی خولیای وێنەکێشانن چەندە؟

**١٥** چەشنی پەیژەی ژمارەیی لەم ستوونە ڕوونکردنەوەییەدا چەندە؟

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**ئاگاداربە!**

- هەموو ناوەڕۆکەکە بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت لە پرسیار.
- وەڵامەکانت ساغبکەوە.

**وەڵامی گونجاو دەوربدە لە ڕاهێنانی ١ تا ٨**

**١** کاتژمێرەکە ئاماژە بۆ چ کاتژمێرێك دەکات؟



أ ٦:٤٠    ج ٧:٤٢
ب ٧:٣٦    د ٨:٤١

**٢** ئاراس ویستی پارچە شیرینیەك بکرێت نرخەکەی ١٧٥٠ دینارە، کام لەمانەی خوارەوەی پێیە تاوەکو شیرینەکە بکرێت؟

أ ٣ پێنج سەد دیناری و ١دوو سەدوپەنجا دیناری.
ب ٣ پێنج سەد دیناری و ٣ دووسەدوپەجا دیناری.
ج ٤ پارچە دووسەدو پەنجا دیناری و ٢ پێنج سەد دیناری.
د ٢ پێنج سەد دیناری و ٥ دوو سەدوپەنجا دیناری.

**٣** ٨٧٢ نزیکبکەوە بۆ نزیکترین ١٠٠.

أ ٧٠٠    ب ٨٠٠    ج ٩٠٠    د ١٠٠٠

**خشتەی سەرژمێری بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانی ٤ تا ٦.**

| ڕەنگی کراسەکان | |
|---|---|
| ڕەنگی کراس | ڕەنگی کراسی پەسندکراو |
| سوور | 𝍸 \|\| |
| زەرد | \|\|\| |
| کەسك | 𝍸 |
| شین | 𝍸 \|\|\|\| |

**٤** ژمارەی هەموو کراسەکان چەندە؟

أ ٤    ب ١٤    ج ٢١    د ٢٤

**٥** کام ڕەنگ لە هەموویان کەمتر باوە؟

أ سوور    ب کەسك    ج زەرد    د شین

**٦** ژمارەی ئەوانەی کراسیان شینە چەندی زیاترە لەوانەی کراسیان زەردە؟

أ ٤    ب ٥    ج ٦    د ٧

**ئەم خشتەیە بەکاربێنە بۆشیکارکردنی ڕاهێنانی ٧ و٨.**

| بەستووە پەسندەکان | |
|---|---|
| بەستووەکان | سەرژمێری |
| ئایس کریم | ١٦ |
| شوکولاتە | ٣٢ |
| مۆتە | ١٩ |
| فەستق | ١١ |

**٧** ژمارەی ئەوانەی ڕای خۆیان دەربڕی چەند بوون؟

أ ٣٢    ب ٦٨    ج ٧٦    د ٧٨

**٨** ژمارەی ئەوانەی بەستووەکانی مۆتە وفستق پێکەوە پەسند دەکەن چەندن؟

أ ١١    ب ٣٠    ج ٣٦    د ئەوانی کە ؟

## ئەوەی دەیزانی بینووسە

**٩** شەمام زارەکەی ٢٠ جار هەڵدا ئەمانەی دەستکەوت:

٢، ٢، ١، ٣، ٤، ٤، ٤، ٣، ٢، ١، ٤، ٣، ١، ٣، ٤، ١، ٢، ١، ٣، ٤، ١.

خشتەیەکی سەرژمێری دروستبکە بۆ نواندنی ئەم پێدراوانە. کام ژمارە لەوانی تر پتر دەرکەوت؟

بەشی ٤

# لێکدان

لە هەر ساڵێك زەوی ملیونەها کیلۆگرام مێوە بەرهەم دێنێ، بەری مێوەکان بە نرخەکانیان جیاوازن. زانینی ئەو نرخانە یارمەتیمان دەدات بۆ کرینی باشترین مێوە.

**شیکارکردنی پرسیارەکان** خشتەی خوارەوە بەکاربێنە بۆ ئەوەی بزانی نرخی ۳ هەلوژە چەند دیناری زیاتر لە نرخی ۳ کێوی.

**بەهای مێوە**

| | |
|---|---|
| سێو | 🧺🧺🧺🧺🧺🧺 |
| پرتەقال | 🧺🧺🧺🧺 |
| هەنار | 🧺🧺🧺 |
| مۆز | 🧺🧺🧺🧺 |
| کێوی | 🧺🧺🧺 |
| خۆخ | 🧺🧺 |
| هەلوژە | 🧺🧺🧺🧺🧺🧺 |

🧺 = ۱۰۰۰ دینار

# زانیارییەکانت ساغبکەوە



ئەم لاپەڕەیە بەکاربهێنە بۆ دڵنیابوون لە هەبوونی
ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە لەم بەشەدا

## ژماردن بە بازدان

**١** ژماردن بۆ پێش دوو دوو.



٢، ٤، ٦، ▢، ▢، ▢، ▢

**٢** ژماردن بۆ پێش پێنج پێنج.



٥، ١٠، ١٥، ▢، ▢، ▢

## ئاڵوگۆڕ لە کۆکردنەوە

تەواو بکە

**٣** ٤ + ٧ = ٧ + ▢

**٤** ٨ + ٥ = ٥ + ▢

## کۆکردنەوەی کۆمەڵە یەکسانەکان

ژمارەی هەموویان چەندە؟

**٥**



٣ کۆمەڵە لە ٣ = ▢

**٦**



٥ کۆمەڵە لە ٢ = ▢

**٧**



٣ کۆمەڵە لە ٤ = ▢

ژمارەی هەموویان چەندە؟ دەتوانیت وێنەیەك بکێشی.

**٨** ٢ کۆمەڵە لە ٥ = ▢ .

**٩** ٣ کۆمەڵە لە ٥ = ▢ .

**١٠** ٢ کۆمەڵە لە ٢ = ▢ .

**١١** ١ کۆمەڵە لە ٣ = ▢ .

## کۆکردنەوەی ستوونی

کۆبکەوە.

**١٢**
١
٤
+٦

**١٣**
٦
٦
+٦

## کۆکردنەوە

کۆبکەوە.

**١٤** ٣ + ٣ + ٣ + ٣ = ▢

**١٥** ٨ + ٠ = ▢

وانەی ١

# لێکدان و کۆکردنەوە

## پێداچوونەوەی خێرا

١ ٣ + ٣ + ٣ = 

٢ ٥ + ٥ + ٥ = 

٤ ٢ + ٢ + ٢ + ٢ = 

٥ ٤ + ٤ + ٤ = 

## زاراوەکان

لێکدان

## فێربە

**شەربەتی سێو ڤیتامینی زۆری تێدایە** سازان ٥ سندوق لە شەربەتی کڕی، هەر سندوقێك ٣ پاکەتی تێدایە، سازان چەند پاکەتی کڕی؟



دەتوانی کۆ بکەیەوە بۆ دۆزینەوەی وەڵام

**بنووسە:** ٣ + ٣ + ٣ + ٣ + ٣ = ١٥

**بخوێنە:** ٥ جاران ٣ یەکسانە بە ١٥

دەتوانی **لێکبدەی** بۆ دۆزینەوەی وەڵام

**بنووسە:** ٥ × ٣ = ١٥

**بخوێنە:** ٥ جاران ٣ یەکسانە بە ١٥

٥ لێکدانی ٣ یەکسانە بە ١٥

**لە بیرمەکە** کاتێك هەر کۆمەڵەیەك هەمان ژمارەی شتەکانی خۆی تێدابێت، دەتوانی لێکدان بکەی بۆ دۆزینەوەی ژمارەی هەموو شتەکان.

- ئایا دەتوانی لێکدان بەکاربهێنی بۆ ئەژمێرکردنی ٢ + ٢ + ٢ + ٢؟ ڕوونیبکەوە.

**ڕێنوێنی** ئایا دەتوانی لێکدان بەکاربهێنی بۆ ئەژمێرکردنی ٢+٣+٢؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەوە.

لێکدان لە ١ ئەگەر سازان یەك سەندوق بکڕێت ئەوا ژمارەی پاکەتی ئەو شەربەتانەی سازان کڕیویەتی دەبێتە ١×٣=٣.



**لە بیرمەکە** کاتێك ژمارەیەك جارانی ١ دەکرێت ئەنجامی لێکدان هەمان ژمارە خۆیەتی.

**لێکدان لە سفر** ئەگەر سازان هیچ سندوقێکی نەکڕی بێت، ئەوا ژمارەی پاکەتی ئەو شەربەتانەی سازان کڕیویەتی ٠ × ٣ = ٠

**لە بیرمەکە** کاتێك ژمارەیەك لە سفر دەدرێت ئەنجامی لێکدان دەبێتە سفر.

## ساغبکەوە

١ ژمارەی پاکەتەکان لەهەر سندوقێکدا بریتییە لە ٤، سازان ٣ سندوقی کڕی، دوو ڕێگا بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی ژمارەی پاکەتەکان.

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

وێنەکە بخوێنەو تەواوبکە.

٢



أ ▢ کۆمەڵەکان لە ▢ = ▢

ب ▢ + ▢ + ▢ = ▢

ج ▢ × ▢ = ▢

٣



أ ▢ کۆمەڵەکان لە ▢ = ▢

ب ▢ + ▢ + ▢ = ▢

ج ▢ × ▢ = ▢

٤ هێڵێك بکێشە کە هەریەك لە ڕستەی کۆکردنەو ببەستێت بە ڕستەیەکی لێکدانی گونجاو.

| | |
|---|---|
| ٤ + ٤ + ٤ = ١٢ | ٦ × ٢ = ١٢ |
| ٢ + ٢ + ٢ + ٢ + ٢ + ٢ = ١٢ | ٣ × ٤ = ١٢ |
| ٠ + ٠ + ٠ = ٠ | ٣ × ٠ = ٠ |

٥ **ڕێنوێنی** ئایا دەتوانی لێکدان بەکاربهێنی بۆ دۆزینەوەی سەرجەمی ١٠+١٠+١٠+١٠+١٠ وەڵامەکەت ڕوونبکەوە.

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

٦ سەیران ٣ ریز لەهەر ریزێك ٩ پوولی هەیە، بەفرین دوو ریز لەهەر ریزێك ٦ پوولی هەیە، ژمارەی پوولەکانی سەیران وبەفرین پێکەوە چەندە؟

أ ٢٧ ب ٥٦ ج ٣٩ د ٦٠

وانەی ٢

# لێکدان لە ٢ و لە ٥

## پێداچوونەوەی خێرا

ژمارەی شتەکان چەندە؟

١ کۆمەڵەیەك لە ٩

٢ ٣ کۆمەڵە لە ٢

٣ ٢ کۆمەڵە لە ٥

٤ ٤ کۆمەڵە لە ٢

## زاراوەکان

**کۆلکەی لێکدان**

**ئەنجامی لێکدان**

## فێربە

**بەردی بەکەڵك** هەندێ لە پارچەکانی بژمێر لە کانزا دروست دەکرێت کە لە هەندێ بەرد دا هەیە، مامۆستا داوای لە پێنج قوتابی کرد هەر یەکیان دوو بەردی بچووك لەگەڵ خۆیان بێنن. قوتابیان چەند بەردیان هێناوە؟

پەیکە بەکاربهێنە.



قوتابیان ٥ کۆمەڵەیان هێناوە هەریەکیان ٢ی تێدایە.

لەبەر ئەوەی هەموو کۆمەڵەکان هەمان ژمارەیان تێدایە، دەتوانی لێکدان ئەنجام بدەی بۆ ئەوەی ژمارەی بەردەکان بزانی.

٥ × ٢ = ١٠

٥ ← کۆلکەی لێکدان، ٢ ← کۆلکەی لێکدان، ١٠ ← ئەنجامی لێکدان

٢ ⟵ کۆلکەی لێکدان

× ٥ ⟵ کۆلکەی لێکدان

١٠ ⟵ ئەنجامی لێکدان

کەواتە، قوتابیان ١٠ بەردیان هێناوە.

**لە بیرمەکە** ئەو ژمارانەی کە لە یەکتریان دەدەی پێی دەوترێ **کۆلکەی لێکدان** (بەهەریەکیان دەوترێ **کۆلکەی لێکدان**) وە بە ئەنجام دەوترێ **ئەنجامی لێکدان**.

- کۆلکەکان و ئەنجامی لێکدان دیاربکە ٣ × ٢ = ٦

## نموونە

أ ئەنجامی لێکدانی ٢ × ٦ بدۆزەوە



کۆدەکەمەوە: ٦ + ٦ = ١٢

بۆیە، ٢ × ٦ = ١٢

ب ئەنجامی لێکدانی ٥ × ٤ بدۆزەوە



کۆدەکەمەوە: ٤ + ٤ + ٤ + ٤ + ٤ = ٢٠

بۆیە، ٥ × ٤ = ٢٠

## ساغبکەوە

**١** ئەنجامی لێکدانی ١×١، ٢×٢، ٣×٢، ٥×٢ بدۆزەوە. چ تێبینی دەکەی لە ئەنجامی لێکدانەکە؟ ئایا هەردەم جووتە یان تاکە؟

ئەنجامی لێکدان بدۆزەوە.

**٢**



ــــ = ٢ × ٤

**٣**



ــــ = ٥ × ٣

**٤**



ــــ = ٢ × ٦

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

کۆپی بکەوە پاشان ئەم دوو خشتەی لێکدان تەواوبکە.

| × | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| **٥** ٢ | | | | | | | | | |
| **٦** ٥ | | | | | | | | | |

تەواوبکە.

**٧** ــــ = ٢ × ٨

**٨** ٥ × ٩ = ــــ

**٩** ٢ × ٨ = ــــ

**١٠** ٥ × ٨ = ــــ

**١١** ــــ × ٢ = ٣ + ٣

**١٢** مامۆستای زانست ٨ قەفەزی ئامادەکرد هەریەکیان ٢ بولبولی تیابوو، مامۆستا چەند بولبولی ئامادەکرد؟

**١٣** **هەڵە لە کوێیە؟** قوتابخانەی هەولێری بەهرەداران ٥ هۆڵی خوێندنی هەیە، هەر هۆڵێك ٦ کۆمپیوتەری تیدایە، ئازاد گوتی لە هۆڵەکان ١١ کۆمپیوتەر هەیە؟ هەڵەی ئازاد لە کوێیە؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٤** کلارا ٥ مورووی بە هەر داوێك لە ٩ داوەکەوەکرد. چەند مورووی بەکارهێناوە؟

أ ٤٥ ب ٥٤ ج ٧٢ د ٨١

وانەی
٣




# ڕیزکراوەکان



## پێداچوونەوەی خێرا

دەکاتە چەند

١ ٢ کۆمەڵەیەك لە ٢ ؟

٢ ١ کۆمەڵە لە ٩؟

٣ ٤ کۆمەڵە لە ٢؟

٤ ٣ کۆمەڵە لە ٤؟

## زاراوەکان

ڕیزکراوەکان

سیفەتی ئاڵوگۆڕ لە لێکدان

**کەرەستەکان** چوارگۆشەکان

## فێربە

کاتێك چەند شتێك لە ڕێز و ستوونەکان ڕێك دەخەی **ڕیزکراوە** بەدەست دێنیت.

### چالاکی

چوارگۆشەکان بەکاربهێنە بۆ پێکهێنانی ڕیزکراوەیەك کرداری ٣ × ٥ بنوێنێ.

**هەنگاوی ١**

ڕیزکراوەیەك لە ٣ ڕیز و ٥ ستوون دروست بکە.




**هەنگاوی ٢**

چوار گۆشەکان بژمێرە.



٣ ڕیز لە ٥ = ▢

٣ × ٥ = ▢

- چەند چوارگۆشە لە ٣ ڕیزی ٥ چوارگۆشەیی هەیە؟
- ڕستەیەکی لێکدان بنووسە کە ڕێگات دەدات بە هەژمێرکردنی ژمارەی چوارگۆشەکان.
- ڕیزکراوەیەکی ٣ ڕیزی لە ٣ چوارگۆشە پێك بێنە.

  شێوەی ئەم ڕیزکراوانە چییە؟

  ڕستەی لێکدان بنووسە کە ڕێگات دەدات بە هەژمێرکردنی ژمارەی چوارگۆشەکان.

### هەوڵبدە

ڕیزکراوەکە بخوێنە ئینجا تەواوی بکە.

أ



▢ ڕیزەکان لە ▢ = ▢

▢ × ▢ = ▢

ب



▢ ڕیزەکان لە ▢ = ▢

▢ × ▢ = ▢



## بەیەك بەستەوە

سیفەتی **ئالوگۆڕ لە لێکدان** ئەنجامی لێکدانی دوو ژمارە ناگۆڕێت، ئەگەر شوێنیان بگۆڕین.
ڕیزکراوەکان بەکاربهێنە بۆ دیاریکردنی ئەم سیفەتە.

### نموونە

أ



٤ ڕیز لە ٥
٤ × ٥ = ٢٠



٥ ڕیز لە ٤
٥ × ٤ = ٢٠

کەواتە: ٤ × ٥ = ٥ × ٤

ب



٦ ڕیز لە ٢
٦ × ٢ = ١٢



٢ ڕیز لە ٦
٢ × ٦ = ١٢

کەواتە: ٦ × ٢ = ٢ × ٦

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

ڕیزکراوەکان بخوێنەوە و تەواو بکە.

**١**



___ ڕیزەکان لە ___ = ___
___ × ___ = ___

**٢**



___ ڕیزەکان لە ___ = ___
___ × ___ = ___

**٣**



___ ڕیزەکان لە ___ = ___
___ × ___ = ___

ڕیزکراو وێنە بکێشە بۆ لێکدان.

**٤** ٢ × ٤    **٥** ٤ × ٢    **٦** ٥ × ٧

**٧** ٤ × ٤    **٨** ١ × ٦    **٩** ٧ × ٤

**١٠** **ڕێنوێنی** هەکار ٢٠ پێنووسی لایە، دەیەوێت لە ٥ پاکەتیان دابنێ هەر یەکەیان ٥ پێنووس بگرێت. ئایا پاکەتەکانی هەکار هەموو پێنووسەکان دەگرن؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەوە.

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١١** کام ڕیزکراوە ٤ × ٥ دەنوێنێ؟

أ



ب



ج



د



وانەی ٤

# لێكدان لە ٣

## پێداچوونەوەی خێرا

١ ٢ + ٢ = ٢ × ▢

٢ ٥ + ٥ + ٥ = ٥ × ▢

٣ ٢ × ٦ = ٦ + ▢

٤ ▢ × ٥ = ١٠

## فێربە

**پایسكلی سێ تایە** ئەنكی دارا ٥ پایسكلی ٣ تایەی بۆ ئەوەكانی كڕی هەر پایسكلێ چەند تایەی هەیە؟ ژمارەی تایەكانی هەموو پایسكلەكان چەندن؟

دەتوانی كۆبكەیەوە بۆ دۆزینەوەی وەڵام.
٣ + ٣ + ٣ + ٣ + ٣ = ١٥

دەتوانی بەلێكدان ئەنجام بدۆزیتەوە.
٥ × ٣ = ١٥

ژمارەی هەموو تایەكان ١٥ تایە

**خشتەی لێكدان لە ٣**

= ١ × ٣ = ٣
= ٢ × ٣ = ٦
= ٣ × ٣ = ٩
= ٤ × ٣ = ١٢
= ٥ × ٣ = ١٥
= ٦ × ٣ = ١٨
= ٧ × ٣ = ٢١
= ٨ × ٣ = ٢٤
= ٩ × ٣ = ٢٧
= ١٠ × ٣ = ٣٠



**نموونە** هاوكار یاریزانێكی تۆپی پێی بەناوبانگە، ڕۆژانە ٣ كاتژمێر مەشق دەكات. لە هەفتەیەكدا چەند كاتژمێر مەشق دەكات؟ ئەگەر زانیت ڕۆژانی هەینی مەشق ناكات.

بۆ ئەوەی ئەنجام بدۆزیتەوە ٦ لە ٣ بدە، ٦ × ٣ = ١٨ كاتژمێر دەست دەكەوێت.

**نموونە** هێمن ٣ ڕۆژ لە هەفتەیەك مەشق دەكات لەهەر جارێك ٦ كاتژمێر.
چەند كاتژمێر لە هەفتەیەكدا مەشق دەكات؟
كامیان زیاتر مەشق دەكات هێمن یان هاوكار؟
ژمارەی كاتژمێرەكان ٦ + ٦ + ٦ = ١٨ = ٣ × ٦
هێمن و هاوكار هەمان كاتژمێر مەشق دەكەن.

## ساغبکەوە

١ ئەگەر زانیت ٦ × ٣ = ١٨، ئایا دەتوانی ئەنجامی لێکدانی ٣×٦ بڵێی؟

٢ کە ژمارەیەك لە ٣ دەدەی، ئایا ژمارەی جووت یان تاك دەردەچێت؟ ئەوە ڕوونبکەوە.

**لێکدان لە ژمارە ٣ بەکاربهێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنان لە ٣ تا ٨.**

٣ ٣ × ٦ = ▢

٤ ٦ × ٣ = ▢

٥ ٣ × ٨ = ▢

٦ ٥ × ٣

٧ ٣ × ٥

٨ ٣ × ٩

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

٩ **هەڵە لە کوێیە؟** کەیوان هەفتەی ٣ ڕۆژ مەشقدەکات، هەر ڕۆژێك ٢ کاتژمێر هەتا ٤ هەفتە بەردەوام بوو. کەیوان ووتی ٦ کاتژمێر لە مانگێکدا مەشقمکردووە. کەیوان لە کوێ هەڵەی کردووە؟

١٠ **ڕێنوێنی** ئەگەر ٣ کۆ بکەیتەوە لەگەڵ ژمارەی تاك، ئایا ژمارەیەکی جووت یان تاکت دەست دەکەوێت؟ ئەگەر ٣ لە ژمارەی تاك بدەیت، ئایا ژمارەیەکی جووت یان تاکت دەست دەکەوێت؟

**ستوونەکانی ڕوونکردنەوەیی بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانەکانی ١١ تا ١٣.**




١١ تیپەکە چەند گۆڵی لە خولی ٤ زیاتر کرد لە خولی ١؟

١٢ تیپەکە چەند گۆڵی بەدەست هێنا لەهەر چوار خولەکە؟

١٣ ئەگەر تیپەکە خولی پێنجەم یاری بکات و دوو ئەوەندەی خولی ٣ گۆڵ بەدەست بێهێنێ، چەند گۆڵ دەکات؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

١٤ صباح ٣ ژەم دەخوات ڕۆژانە لە میانەی هەفتەیەکدا. چەند ژەمی خواردووە؟

أ ١٨ ب ١٥ ج ٢١ د ٢٢

وانەی
٥

# لێکدان لە ٤



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ٣ × ٠
٢ ٢ × ٤
٣ ٩ × ١
٤ ١ × ٨

## فێربە

**شاری یاری** قوتابیانی پۆلی سێیەم بە ٦ ئۆتۆمبێل چوونە شاری یاری. هەر ئۆتۆمبێلێك ٤ قوتابی هەڵدەگرێت، ژمارەی قوتابییەکان چەندە؟

٦ لە ٤ بدە بۆ دۆزینەوەی ژمارەی قوتابیان:

٦ × ٤ = ▢

پێویستە خشتەی لێکدانی بەرامبەر بەکاربهێنی بۆ شیکارکردنی پرسیارەکە، ئەگەر ویستت ئەنجامی لێکدانی دوو ژمارە بدۆزیەوە، ئەو ژمارەیە بخوێنەوە کە دەکەوێتە یەکتربڕینی ڕیزی ژمارەی یەکەم لەگەڵ ستونی ژمارەی دووەم.

ستوون

| × | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ١ | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
| ٢ | ٠ | ٢ | ٤ | ٦ | ٨ | ١٠ | ١٢ | ١٤ | ١٦ | ١٨ |
| ٣ | ٠ | ٣ | ٦ | ٩ | ١٢ | ١٥ | ١٨ | ٢١ | ٢٤ | ٢٧ |
| ٤ | ٠ | ٤ | ٨ | ١٢ | ١٦ | ٢٠ | ٢٤ | ٢٨ | ٣٢ | ٣٦ |
| ٥ | ٠ | ٥ | ١٠ | ١٥ | ٢٠ | ٢٥ | ٣٠ | ٣٥ | ٤٠ | ٤٥ |
| ٦ | ٠ | ٦ | ١٢ | ١٨ | ٢٤ | ٣٠ | ٣٦ | ٤٢ | ٤٨ | ٥٤ |
| ٧ | ٠ | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ | ٣٥ | ٤٢ | ٤٩ | ٥٦ | ٦٣ |
| ٨ | ٠ | ٨ | ١٦ | ٢٤ | ٣٢ | ٤٠ | ٤٨ | ٥٦ | ٦٤ | ٧٢ |
| ٩ | ٠ | ٩ | ١٨ | ٢٧ | ٣٦ | ٤٥ | ٥٤ | ٦٣ | ٧٢ | ٨١ |

ڕیز

ئەنجامی یەکتربڕینی ڕیزی ژمارە ٦ لەگەڵ ستوونی ژمارە ٤ دەبینی.

٦ × ٤ = ٢٤

کۆلکەی لێکدان، کۆلکەی لێکدان، ئەنجامی لێکدان

٤ ← کۆلکەی لێکدان
×٦ ← کۆلکەی لێکدان
٢٤ ← ئەنجامی لێکدان

کەواتە، ژمارەی قوتابییەکان ٢٤

**لە بیرمەکە** ئەنجامی لێکدانی هەر ژمارەیەك لە ٤ ژمارەیەکی جووتە.

**ڕێنوێنی** چۆن ڕوونی دەکەیتەوە ٢ × ٥ کۆ ٢ × ٥ یەکسانە بە ٤ × ٥؟

**بیرکردنەوەی ڕەخنەگر** کامیان ئاسانترە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدانی ٤ × ٦ ، ٦ چوارجار کۆبکەیتەوە یان خشتەی لێکدان بەکاربهێنیت؟ هۆیەکەی ڕوونبکەوە.



## ساغبکەوە

١ ڕوونیبکەوە چۆن خشتەی لێکدانی بۆ دۆزینەوەی ٤ × ٨ بەکاردێنی؟

**لێکبدە**

٢ ٢ × ٤ = ▢ ٣ ٩ × ٤ = ▢

٤ ▢ = ٤ × ٥ ٥ ٤ × ٣ = ▢

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

**بۆشاییەکان پڕبکەوە لە خشتەی لێکدان لە ٤.**

٦

| × | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٤ | | | | | | | | | |

**بۆشایی پڕبکەوە لە ڕاهێنانەکانی ٧ تا٩.**

٧ ٩ × ٠ = ▢ × ٤ ٨ ٢ × ٩ = ▢ × ٣ ٩ ٤ × ٤ = ▢ × ٢

١٠ ٥ لە ٤ بدە. ١١ ئەنجامی لێکدانی ٤ لە ٩ چەندە؟

١٢ ئەنجامی لێکدانی ٧ لە سفر چەندە؟ ١٣ ئەنجامی لێکدانی ١ لە ١٢ چەندە؟

١٤ لە باخچەیەکی ئاژەڵان ٤ قەفەس بولبل هەیە، هەر قەفەسێك ٨ بولبلی تێدایە، ژمارەی بولبەکان چەندە؟

١٥ ئایا ٦ ×٤ گەورەترە لە ٣ ×٧ یان بچووکترە یان یەکسانە؟ ڕوونیبکەوە.

١٦ لەبەر ئەوەی ٩ ×٤= ٣٦ و ١٠ × ٤ = ٤٠، ١١ × ٤ دەکاتە چەندە؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

١٧ لە قەفەسێکدا ٦ کەروێشك هەیە، ژمارەی قاچەکانیان چەندە؟

أ ٦ ب ٢٤ ج ٣٠ د ١٦

وانەی ٦

# ڕێگاکان لەسەر لێکدان



### پێداچوونەوەی خێرا

١. ٣ × ▢ = ١٢

٢. ٢ × ٦ = ▢

٣. ٠ × ٨ = ▢

٤. ٩ × ▢ = ٩

## فێربە

**لە فرۆکەخانە** کارزان چوو بۆ فرۆکەخانە، سەردانی ٦ بەش لە بەشەکانی کرد، لەهەر بەشێك ٣ فرۆکە هەیە، چەند فرۆکەی بینی؟

٦ × ٣ = ▢

لێرەدا زۆر ڕێگا هەیە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان.

أ دەتوانیت کۆمەڵەی یەکسان پێکبێنی:



٦ × ٣ = ١٨



ب دەتوانیت ڕیزکراوە پێکبێنی: ٦×٣=١٨

ج دەتوانیت سیفەتی ئالوگۆڕ بەکاربێنی: ٦×٣=٣×٦=١٨

د دەتوانیت خشتەی لێکدان بەکاربێنی:

ستون ↓

ڕیز ←

| × | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ١ | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
| ٢ | ٠ | ٢ | ٤ | ٦ | ٨ | ١٠ | ١٢ | ١٤ | ١٦ | ١٨ |
| ٣ | ٠ | ٣ | ٦ | ٩ | ١٢ | ١٥ | ١٨ | ٢١ | ٢٤ | ٢٧ |
| ٤ | ٠ | ٤ | ٨ | ١٢ | ١٦ | ٢٠ | ٢٤ | ٢٨ | ٣٢ | ٣٦ |
| ٥ | ٠ | ٥ | ١٠ | ١٥ | ٢٠ | ٢٥ | ٣٠ | ٣٥ | ٤٠ | ٤٥ |
| ٦ | ٠ | ٦ | ١٢ | ١٨ | ٢٤ | ٣٠ | ٣٦ | ٤٢ | ٤٨ | ٥٤ |
| ٧ | ٠ | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ | ٣٥ | ٤٢ | ٤٩ | ٥٦ | ٦٣ |
| ٨ | ٠ | ٨ | ١٦ | ٢٤ | ٣٢ | ٤٠ | ٤٨ | ٥٦ | ٦٤ | ٧٢ |
| ٩ | ٠ | ٩ | ١٨ | ٢٧ | ٣٦ | ٤٥ | ٥٤ | ٦٣ | ٧٢ | ٨١ |

**بەبیر خۆت بێنە** ئەنجامی لێکدانی ژمارەکە دەکەوێتە لای یەکتربڕینی ڕیزی ٦ لە ستونی ٣: ٦×٣=١٨

ژمارەی فرۆکەکان دەکاتە ١٨ فرۆکە.

**لە بیرمەکە** دەتوانیت ڕێگاکانی جیاواز بەکاربهێنیت بۆ هەژمێرکردنی ئەنجامی لێکدانەکە.

## ساغبکەوە

١ ڕوونبکەوە دوو ڕێگا بەکاربێنە بۆ دۆزینەوەی ٨×٤.

ڕستەی لێکدان بۆ هەر شێوەیەك بنووسە.

٢ 

٣ 

٤ 

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

لێکبدە

٥ ٦ × ٥ =

٦ ٢ × ٤ =

٧ ٧ × ٣ =

٨ ٨ × ٥ =

٩ ٩ × ٣

١٠ ٠ × ٦

١١ ٥ × ٧

١٢ ٨ × ٣

بۆشاییەکان بە ژمارەی گونجاو پڕ بکەوە.

١٣

| × | ٢ | ٥ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣ | | | | | |

١٤

| × | ١ | ٦ | ٩ | ٧ | ٨ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٥ | | | | | |

١٥ **ڕێنوێنی** سۆزان ٤ دەنکە شیرینی و دوو سێوی لە پاکەتێك دانا، ٢٤ دەنکە شیرنی بەکارهێنا، چەند سێوی بەکارهێنا؟

١٦ سەفین ومەتین ٢٠ ئۆتۆمبیلی بچووکیان لایە، مەتین ئۆتۆمبیلێکی تری کڕی بۆ ئەوەی ژمارەی ئۆتۆمبیلەکانی سەفین بکاتە نیوەی ژمارەی ئۆتۆمبیلەکانی مەتین. هەریەکەیان چەند ئۆتۆمبیلی هەیە.

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

١٧ لە کێڵگەیەکدا ٥ چێڵ و دوو مریشك هەیە. ژمارەی قاچەکانیان چەندە؟

أ ٢٤　ب ٢٨　ج ١٤　د ٢٠

وانەی ٧

# ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان

## بەدوای شێوازدا بگەڕێ



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ٣ × ▢ = ٦

٢ ٣ × ▢ = ٩

٣ ▢ × ٤ = ١٢

٤ ٣ × ▢ = ١٥

**پرسیار** ماردین و برادەرەکەی یاری شێوازی ژمارەیی دەکەن. برادەرەکەی ژمارەکانی، ٣، ٥، ٨، ١٠، ١٣، ١٥، ١٨، ٢٠، ٢٣ نووسی، پێویستە ماردین ڕێسای شێوازەکە دیار بکات، چوار ژمارەی دوای ژمارە ٢٣ بنووسێ.

### تێبگە



- داواکراو چییە؟
- ئەو پێدراوانەی کە بەکارت هێناوە چییە؟
- ئایا پێدراوی تر هەیە بەکارت نەهێنابێ؟ چییە؟

### پلاندانێ



- کام ڕێگا بەکاردەهێنیت بۆ شیکارکردنی پرسیارەکە؟

دەتوانی ڕێگای «بەدوای شێواز بگەڕێ» بەکاربێهێنی.

### شیکاربکە

- چۆن ئەو ڕێگایە لە شیکارکردنەکە بەکاردێنی.




ڕێساکە ئەوەی ٢ زیاد بکە، پاشان ٣ زیادبکە یەك لەدوای یەك.

چوار ژمارەی دواییان ئەمانەن ٢٥، ٢٨، ٣٠، ٣٣.

### ساغبکەوە



- چون ڕاستی وەلامەکەت ساغدەکەیتەوە؟

**بیری ڕەخنەگر:** ڕێسای شێواز دیار بکە ئەگەر شێوازەکە بەم شێوەیە بوو: ٣؛ ٦؛ ٨؛ ١١؛ ١٣؟

## ڕاهێنــان و شیکــارکــردنــی پرسیــارەکـان

ڕێگەی «بەدوای شێواز بگەڕێ» بەکاربهێنە بۆ شیکاری پرسیارەکان.

**١** وا دابنێ کە شێواز ٥، ٤، ٩، ٨، ١٣، ١٢، ١٧، ١٦، ٢١. ڕێسای شێواز دیاربکە و چوار ژمارەی دوای ژمارەی ٢١ دێن بنووسە.

**٢** شێوازی دانا ئەوەیە: ٣، ٦، ٩، ١٢. ڕێسای شێوازەکە دیاربکەو چوار ژمارە دوای ژمارە ١٢ دێن بنووسە.

**ئازاد بە نەوزادی گووت: من بیر لە شێوازێك دەکەمەوە ژمارە یەکەمەکانی ئەمانەن: ٤، ٨، ١٢، ١٦.**

**٣** سێ ژمارەی دوای ئەوە چین؟

أ ١٦، ٢٠، ٢٤،     ج ١٨، ٢٠، ٢٢

ب ١٧، ١٩، ٢١     د ٢٠، ٢٤، ٢٨

**٤** کام ژمارە نابێت لە شێوازی ئازاد بێت؟

أ ٢٠     ج ٣٢

ب ٢٨     د ٣٥

### ڕێگەکانی شیکاری پرسیارەکان

- هێلکاریەك یان وێنە بکێشە
- نموونەیەك دروستبکە بەکردار جێبەجێی بکە.
- لیستێکی ڕێك دروست بکە.
- **بەدوای شێوازێك بگەڕێ**
- خشتەیەك یان وێنەیکی ڕوونکردنەوەیی دروستبکە.
- بخەملێنە وساغبکەوە بە هەنگاوەکاندا بگەڕێوە شیکاری پرسیارەکە ئاسانتر بکە
- ڕستەیەکی ژمارەیی بنووسە
- دەرئەنجای ژیر بێژی بەکاربێنە.

## ڕاهێنان لەسەر ڕێگا جیاوازەکان

**٥** نەوژین دەیەوێت لە دهۆك بۆ هەولێر بەپێ بڕوات. ڕۆژانە (٦) کاتژمێر دەڕوات، چەند کاتژمێر لە هەفتەیەکدا ڕۆیشتوە، ئەگەر زانیت ڕۆژی هەینی پشوو دەدات.

**٦** **کوا هەڵە؟** خەسرۆ گوتی ئەو ژمارانە ١١، ٢١، ٣١، ٤١، ٥١، ٦٠، ٧١ شێوازێك پێك دێنن لە کوێ هەڵەی کردووە؟ ڕوونی بکەوە چۆن هەڵەکە ڕاست دەکەیتەوە؟

**٧** **بەکارهێنانی پێدراوەکان** ئەگەر ڕامان بەردەوام بوو لەسەر ئەم شێوازە کە لە خشتەکەدا دیارە، چەند مەتر غار دەدات لە ڕۆژی پێنج شەممە؟

**غاردانی ڕامان**

| | |
|---|---|
| شەممە | 🏃🏃 |
| یەك شەممە | 🏃🏃🏃 |
| دووشەممە | 🏃🏃🏃🏃 |

🏃 = ١٠٠ مەتر

بەشی ٤

# پێداچوونەوە

## دلنیابوون لە هەبوونی زاراوەکان و چەمکەکان

دەربڕینی گونجاو لە لیستی بەرامبەر هەڵبژێرە.

| |
|---|
| ڕیزکراوە |
| کۆڵکەی لێکدان |
| سفر |
| ژمارە ١ |
| ئەنجامی لێکدان |

١ بەو ژمارانەی کە لە یەکتریان دەدەین دەوترێت ___؟___ .

٢ کە دوو ژمارە لە یەکتردەدەین ___؟___ دەست دەکەوێت.

٣ ئەنجامی لێکدانی ___؟___ لە هەر ژمارەیەك، ژمارەکە خۆیەتی.

٤ ئەنجامی لێکدانی ___؟___ لەهەر ژمارەیەك دەکاتە سفر.

لێکبدە. لەوانەیە پێکهێنانی ڕیزکراوەکان پێویست بێ.

٥ ٤ × ٥ = ▢ ٦ ٣ × ٢ = ▢ ٧ ٣ × ٦ = ▢

## دڵنیا بوون لە کارامەییەکان

ڕستەی لێکدان هەڵبژێرە کە گونجاوە بۆ ڕستەی کۆکردنەوە.

| |
|---|
| ٥ × ٤ = ٢٠ |
| ٥ × ٠ = ٠ |
| ٦ × ٢ = ١٢ |
| ٤ × ٣ = ١٢ |

٨ ٣ + ٣ + ٣ + ٣ = ١٢ ٩ ٤ + ٤ + ٤ + ٤ + ٤ = ٢٠

١٠ ٠ + ٠ + ٠ + ٠ + ٠ = ٠

ئەنجامی لێکدان بدۆزەوە.

١١ ٣ × ٨ = ▢ ١٢ ٧ × ٣ = ▢ ١٣ ▢ = ٥ × ٦

١٤ ٥ × ١ = ▢ ١٥ ٠ × ٦ = ▢ ١٦ ١ × ٨ = ▢

١٧ ٣ × ٩ ١٨ ٦ × ٣ ١٩ ٨ × ٥

بۆشاییەکان بە ژمارەی گونجاو پربکەوە.

٢٠ ٢ × ▢ = ٨ ٢١ ▢ × ٥ = ٣٠ ٢٢ ١ × ▢ = ٩

## دڵنیا بوون لە شیکارکردنی پرسیارەکان

دیار بکە ئایا پرسیارەکە پێدراوی پتر لە خۆ دەگرێت لەوەی پێویستە، یان کەمتر لەوەی پێویستە یان تەنها ئەوەی پێویستە. پرسیارەکە شیکاربکە لە هەموو بارەکاندا ئەگەر پێدراوەکان کەمبوون دیاریان بکە.

٢٣ شێرزاد ٣ کاتژمێر ڕۆژانە لە شەممە تا چوارشەممە مەشق دەکات، چەند کاتژمێر مەشق دەکات لەم هەفتەیەدا؟

## بەشی ٤

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**ئاگاداربە!**

- هەموو ناوەڕۆکەکە بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت لە پرسیار.
- وەڵامەکانت ساغبکەوە.

**وەڵامی گونجاو دەور بدە لە ڕاهێنانی ١ تا ١٠**

**١** ٣ × ٩ = ؟

أ ٦ ب ١٢ ج ٢٧ د هیچ لەوانە

**٢** دوین ٨ پاکەت ماسی کڕی بەهای هەریەکیان ٥ هەزار دینار بوو، چەند هەزاری داوە؟

أ ٣٠ ب ٣٨ ج ٢١ د ٤٠

**٣** پەیوەند ٦٤ هەزاردیناری هەبوو ٣٥ هەزار دیناری بە تۆپ داوە، کتێبێکی بە ٢٥ هەزار دینار کڕی، ئایا چەند هەزار دیناری لاماوە.

أ ٦٠ ب ٢٩ ج ٣٩ د ٤

**٤** شارا ٢٥ هەزار دیناری لایە. ٧ کارتی پۆستەی کڕی، نرخی هەریەکەیان ٢ هەزار دینارە. چەند هەزار دیناری داوە؟

أ ٩ ب ١٤ ج ١١ د ٢٥



**٥** ئەو کاتژمێرە ئاماژە بۆ چ کاتێك دەکات؟

أ ٦:٠٨ ب ٦:٤٠ ج ٧:٠٨ د ٧:٤٠

**٦** بەهای خانەیی ڕەنووسی ١ لە ٤٠٥ ١٧ کامەیە؟

أ ١٠ ب ١٠٠ ج ١٠٠٠ د ١٠٠٠٠

**٧** مریەم ٨ قاپی هەیە، هەر قاپێك هێلکەیەکی لەناو دانا، چەند هێلکەی بەکارهێنا؟

أ ٠ ب ٦ ج ٤ د ٨

**٨** ژمارەیەك ئەگەر جارانی ژمارەی ٤ بکەین ئەنجام دەبێتە ٣٦، ژمارەکە کامەیە؟

أ ٤٠ ب ٣٢ ج ٩ د ٨

**٩** نەژاد کتێبەکانی لەسەر ٤ ڕەفە دانا، هەر ڕەفەی ٧ کتێبی لەسەرە، ژمارەی کتێبەکان کامەیە؟

أ ٢٨ ب ٢٤ ج ٢١ د ١١

**١٠** کڕیکار لەهەر تورەگەیەك ٥ دەنکە شیرنی دانا. ژمارەی تورەگەکان بووە ٨، ژمارەی دەنکە شیرنیەکان کامەیە؟

أ ١٣ ب ٣٢ ج ٣٣ د ٤٠

## ئەوەی دەیزانی بینووسە

**١١** ڕستەیەکی لێکدان بنووسە کە پەیوەندی بەم ڕستەیەی کۆکردنەوە بێت ٥ + ٥ + ٥ + ٥ = ٢٠، ڕوونی بکەوە.

**١٢** کامەیان گەورەترە؟

٨ × ١ یان ٩ × ٠ ؟

بەشی ٥

# ڕاستییەکانی لێکدان

تیپی مۆسیقای سەربازی بە شێوەی ڕیزکراوە دەڕوۆن هەروەك تیپەکانی سەربازی.

## شیکارکردنی پرسیارەکان

سەیری ئەم وێنەیە بکە، بۆ هەر تیپێك ریزکراوەیەك بکێشە کە دەیان نوێنێ.

### تیپی مۆسیقای سەربازی

| | |
|---|---|
| پیادە | 🎺🎺🎺 |
| فرۆکەوانی | 🎺🎺🎺🎺 🎺🎺🎺🎺 |
| دەریایی | 🎺🎺🎺🎺 🎺🎺🎺 |

🎺 = ٤ سەرباز

# زانیارییەکانت ساغبکەوە



ئەم لاپەڕەیە بەکاربهێنە بۆ دڵنیابوون لە هەبوونی
ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە لەم بەشەدا

## زاراوەکان

دەربڕینێکی گونجاو لە لیستی بەرامبەر هەڵبژێرە.

جیاوازی
کۆڵکەی لێکدان
ئەنجامی لێکدان

١ ژمارە ٢ لە ڕستەی لێکدانی ٢ × ٥ = ١٠ پێی دەوترێ ___؟___ .

٢ ژمارە ١٠ لە ڕستەی لێکدانی ٢ × ٥ = ١٠ پێی دەوترێ ___؟___ .

## کۆکردنەوەی کۆمەڵە یەکسانەکان

ژمارەکە چەندە؟

٣



٢ کۆمەڵە لە ٤ = ▢

٤



٣ کۆمەڵە لە ٦ = ▢

## ژماردن بە بازدان

شێوازەکە تەواو بکە؟

٥ ١٠ ؛ ٢٠ ؛ ٣٠ ؛ ٤٠ ؛ ▢ ؛ ▢

بەرەو پێش یان بەرەو پاش دەدە بژمێرە، بۆ دۆزینەوەی ژمارەی نادیار.

٦ ٣ ؛ ١٣ ؛ ٢٣ ؛ ▢ ؛ ▢ ؛ ٥٣ ؛ ▢ ؛ ▢ ؛ ٨٣ ؛ ▢

٧ ٩٥ ؛ ٨٥ ؛ ٧٥ ؛ ▢ ؛ ▢ ؛ ٤٥ ؛ ▢ ؛ ▢ ؛ ▢

## ڕاستیەکانی لێکدان

لێکبدە؟

٨ ٤ × ١ = ▢

٩ ٩ × ٥ = ▢

١٠ ▢ = ٩ × ٤

١١ ٥ × ٠ = ▢

١٢ ٤ × ٦ = ▢

١٣ ٥ × ٨ = ▢

١٤ ٦ × ٤ = ▢

١٥ ٢ × ٣ = ▢

١٦ ٨ × ٤ = ▢

وانەی ١

# لێکدان لە ٦

پێداچوونەوەی خێرا

١ ٥ × ▢ = ٢٥

٢ ٥ × ٩ = ▢

٣ ▢ × ٥ = ٣٠

٤ ٤٠ = ٥ × ▢

## فێربە

**تیپی پێشمەرگە** ئەگەر ژمارەیەك پێشمەرگەی بینی بەدەستە دەڕۆیشتن. هەر دەستەیەك لە ٦ ڕیز پێك هاتبوون، لەهەر ڕیزێك ٦ پێشمەرگە، ژمارەی پێشمەرگەکان چەندە؟

### نموونە

ئەم پرسیارە بنوێنە بۆ ئەوەی شیکاری بکەیت.

**هەنگاوی ١**

ڕیزکراوەیەك پێك بێنە لە ٦ ڕیز لەهەر ڕیزێك ٦ چوارگۆشەی بچووك.

٦ × ٦ = ▢

**هەنگاوی ٢**

ڕیزکراوەکە بەش بکە بۆ دوو ڕیزکراوەی بچووك.

١ × ٦ = ٦

٥ × ٦ = ٣٠

**هەنگاوی ٣**

ئەنجامی لێکدان کۆبکەوە لە هەردوو ڕیزکراوەکە ئەمەت دەستدەکەوێت.

$$\begin{array}{r} ٦ \\ + ٣٠ \\ \hline ٣٦ \end{array}$$

ئەمەت دەستدەکەوێت:

٦ × ٦ یەکسانە بە ١ × ٦ کۆ ٥ × ٦ واتە ٦ + ٣٠ = ٣٦ کەواتە ژمارەی پێشمەرگەکان لە تیپەکە ٣٦ پێشمەرگە.

### نموونە

ژمارەی پێشمەرگەکان چەند دەبن، ئەگەر تیپەکە ٧ ڕیزبێت لە جیاتی ٦.

وەك لە نموونەی پێشوو:

٧ × ٦ یەکسانە بە ٢ × ٦ کۆ ٥ × ٦ واتە ١٢ + ٣٠ = ٤٢.

**لە بیرمەکە** بۆ ئەوەی هەر ژمارەیەك لە ژمارەیەکی تر بدەی، دوو ژمارە بدۆزەوە سەرجەمیان ژمارەی یەکەم بێت، هەریەك لەو دوو ژمارەیە لە ژمارەی دووەم بدە، پاشان ئەنجامەکانیان کۆ بکەوە.

## ساغبکەوە

**١** ڕاڤە بکە چۆن ئەنجامی ٨ × ٣ هەژماردەکەیت؟ چۆن ئە ڕاستیە بەکاردێنی بۆ دۆزینەوەی ٨ × ٦؟

لێکبدە.

**٢** ٢ × ٦ = ▢

**٣** ٤ × ٦ = ▢

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

خشتەی لێکدان لە ٦ تەواوبکە.

**٤**

| × | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٦ | ▢ | ▢ | ▢ | ▢ | ▢ | ▢ | ▢ | ▢ | ▢ |

بۆشاییەکان بە ژمارەی گونجاو پڕبکەوە لە ڕاهێنانەکانی ٥ تا ١٠.

**٥** ▢ × ٤ = ١٢

**٦** ٤٨ = ٨ × ▢

**٧** ▢ × ٤ = ٣ × ٤

**٨** ▢ × ٦ = ٤٠ + ٨

**٩** ٦ × ٤ = ▢

**١٠** ٦ × ٩ = ▢

**١١** ئامێری گیتار ٦ ژێی هەیە و ئامێری عود ٥ ژێی هەیە، لە ٤ گیتار و ٢ عود چەند ژێ هەیە؟

**١٢** **بنووسە** ڕیزکراوەیەك بکێشە کەوا ڕوونیبکاتەوە ٦ × ٤ یەکسانە بە ١ × ٤ کۆ ٥ × ٤؟

## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٣** ژمارەی نادیار لە ٦ × ▢ = ٤٨ چییە؟

أ ٥    ب ٦    ج ٨    د ١٠

وانەی ٢

# لێكدان لە ٧ و لە ٨



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ) ٦ × ٤ = ▢

٢ ) ٣ × ٦ = ▢

٣ ) ٢ × ٦ = ▢

٤ ) ٥ × ٦ = ▢

## فێربە

**پشوو** پشووی هاوین ٨ هەفتەی خایاند.

پشووی هاوین چەند ڕۆژی خایاند؟

### نموونە

ئەنجامی ٨ × ٧ = ▢

پرسیارێك بنوێنە بۆ ئەوەی شیكاری بكەی.

**هەنگاوی ١**

ڕیزكراوەیەكی ٨ ڕیزی پێكبهێنە كە لە هەریەكیان ٧ چوارگۆشەی بچووك هەبێت.



٨ × ٧ = ▢

**هەنگاوی ٢**

ڕیزكراوەكە بەش بكە بۆ دوو ڕیزكراوەی بچووك.



٨ × ٣ = ٢٤ ٨ × ٤ = ٣٢

**هەنگاوی ٣**

ئەنجامی لێكدانی دوو ڕیزكراوەكە كۆ بكەوە.

$$\begin{array}{r} ٢٤ \\ +\ ٣٢ \\ \hline ٥٦ \end{array}$$

ئەمەت دەست دەكەوێت

٨ × ٧ = ٥٦

كەواتە، ژمارەی ڕۆژەكانی پشووی هاوین ٥٦ ڕۆژە.

**نان** دایكم ٦ نانەقەیسی دروستكرد بۆ هەر نانەك ٨ قەیسی پێویست بوو، ئایا چەند قەیسی پێویستە؟

شێوازێك بەكاربهێنە بۆ دۆزینەوەی وەڵام



١ × ٨ = ٨

٢ × ٨ = ١٦

٣ × ٨ = ٢٤

٤ × ٨ = ٣٢

٥ × ٨ = ٤٠

٦ × ٨ = ٤٨

كەواتە، دایكم پێویستی بە ٤٨ قەیسی هەیە.

## ساغبکەوە

١ ڕوونیبکەوە چۆن ٧ × ٥ بەش دەکەی بۆ دوو بەش، بۆ ئەوەی ئەنجامی لێکدان هەژمێر بکەیت؟

٢ ڕوونیبکەوە چۆن ٤ × ٥ = ٢٠ بەکاردەهێنرێت بۆ ئەوەی ئەنجامی ٨ × ٥ هەژمێر بکەیت؟

٣ ڕوونیبکەوە چۆن ٦ × ٢ = ١٢ بەکاردەهێنرێت بۆ ئەوەی ئەنجامی ٧ × ٢ هەژمێر بکەیت؟

لێکبدە.

٤ ٧ × ٤ = ▢ ٥ ٠ × ٧ = ▢ ٦ ٧ × ٥ = ▢

## ڕاهێنــان و شیــکارکــردنی پــرسیــارەکــان

تەواو بکە

٧ ٧ × ٧ = ▢ ٨ ▢ = ٤ × ٩ ٩ ٨ × ٧ = ▢ ١٠ ٨ × ٦ = ▢

١١ ١ × ٧

١٢ ٧ × ٦

١٣ ٧ × ٨

١٤ ٥ × ٨

١٥ ٩ × ٦

١٦ ٧ × ٩

خشتەی لێکدان لە ٧ تەواو بکە.

١٧

| × | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٧ | | | | | | | | | |

خشتەی لێکدان لە ٨ تەواو بکە.

١٨

| × | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٨ | | | | | | | | | |

١٩ دەوەن ٧ هەفتە پشووی هەبوو. ٣ هەفتەی لە خێوەتگەی دێدەوانی بەسەر برد. ئەوەی تری لە ماڵەوە بەسەربرد چەند ڕۆژی لەماڵەوە بەسەر بردووە؟

٢٠ ئازاد ٧ تورەگە سێوی هەیە، هەریەکیان ٨ سێوی سەوزی تێدایە، تورەکەی هەشتەم سێوی سوری تێدایە. ژمارەی سێوەکان ٦٠، ژمارەی سێوە سوورەکان چەندە؟

٢١ دەرئەنجام چۆن ڕوونیدەکەیتەوە، بێ ئەوەی هەژمار بکەی، کە ٩ × ٧ بچووکترە لە ٩ × ٨؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

٢٢ مازن ملوانکەیەك و ٤ بازنی دروستکرد هەر بازنێك ٨ مورووی تێکرد و ٢٠ مورووش لە ملوانککە کرد، چەند مورووی بەکارهێناوە؟

أ ١٢٠ ب ٣٢ ج ٤٠ د ٥٢

وانەی ٣

# لێکدان لە ٩ و لە ١٠



## پێداچوونەوەی خێرا

١ ٤ × ٨ = ▢

٢ ٧ × ٥ = ▢

٣ ٨ × ٠ = ▢

٤ ٦ × ٧ = ▢

## فێربە

**دارستان** سمۆرە گیانلەبەرێکی ددان گەورەیە دارەکانی پێ دەبڕێت، ٥ سمۆرە هەر یەکەیان ١٠ دار دەبڕێ. چەند داریان بڕیووە؟

٥ × ١٠ = ▢

ژماردن بۆ پێشەوە دەدە ٥ جار بەکاربێنە.




لە بیرتە ٥ × ١٠ واتا ٥ دەیی یان ٥ × ١٠ = ٥ دەیی.

کەواتە ژمارەی دارە بڕاوەکان دەکاتە ٥٠ دار.

**لە بیرمەکە** بۆ ئەوەی ژمارەیەك لە ١٠ بدەی، سفرێك بۆ لای ڕاستی ژمارەکە زیادبکە: ٨ × ١٠ = ٨٠



**لێکدان لە ٩** داوا لە ٩ قوتابی پۆلی سێیەم بکە وێنەی گیانەوەرەکانی دارستانەکە بکێشن، بۆ هەڵواسینیان لە پێشەنگاکە. هەر یەکەیان ٧ وێنەی کێشا.

چەند وێنەیان کێشاوە؟

٧ × ٩ = ▢

شیلان و گەلاوێژ هەڵسان بۆ دۆزینەوەی وەڵام بە دوو ڕێگەی جیاواز.

شیلان
- یەکەم جار ٧ لە ١٠ دەدەم

٧ × ١٠ = ٧٠
- پاشان، ٧ی لێ دەردەکەم

٧٠ − ٧ = ٦٣

کەواتە:

٧ × ٩ = ٦٣

گەلاوێژ

ریزکراوەکان بەکاربهێنە
- یەکەم جار ٧ لە ٥ بدە

٧ × ٥ = ٣٥
- پاشان ٧ لە ٤ بدە

٧ × ٤ = ٢٨
- هەردوو ئەنجام کۆبکە

٣٥ + ٢٨ = ٦٣

٠ × ٩ = ٠

١ × ٩ = ٩

٢ × ٩ = ١٨

٣ × ٩ = ٢٧

٤ × ٩ = ٣٦

٥ × ٩ = ٤٥

٦ × ٩ = ٥٤

٧ × ٩ = ٦٣

٨ × ٩ = ٧٢

٩ × ٩ = ٨١

کەواتە، قوتابیان ٦٣ وێنەیان کێشا.

## ساغبکەوە

١ ڕوونیبکەوە چۆن بە ڕێگەی شیلان ئەنجامی ٣ × ٩ هەژمێر دەکەیت؟

٢ ڕوونیبکەوە چۆن بە ڕێگەی گەلاوێژ ئەنجامی ٣ × ٩ هەژمێر دەکەیت؟

تەواوبکە.

٣ ٣ × ١٠ = ▢

٤ ١٠ × ٦ = ▢

٥ ٨ × ٩ = ▢

٦ ٢ × ٩ = ▢

٧ ▢ × ٧ = ٦٣

٨ ▢ × ٩ = ٩٠

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

تەواوبکە.

٩ ١٠ × ٤ = ▢

١٠ ٩ × ٩ = ▢

١١ ٧ × ١٠ = ▢

١٢ ١٠ × ٨

١٣ ٩ × ٤

١٤ ١٠ × ١

١٥ ١٠ × ٦

بەراورد بکە و هێمای > یان < یان = لە شوێنی ◯ دابنێ.

١٦ ١٠ × ٦ ◯ ٧٥ – ١٥

١٧ ٨ × ٩ ◯ ٩ × ٨

١٨ **بینووسە** نەرمین وتی «٣ × ١٠ یەکسانە بە ١٠ + ١٠ + ١٠»، ئایا لەگەڵ وتنی ئەوی، ڕوونی بکەوە.

١٩ سەمیرە ٣ سینی بچووکی لە کلیچەی گوێزی دروستکرد، هەر سینیەك ١٠ کلیچەی تیادابوو، دوو سینی تریشی لە کلیچەی خورما هەر سینیەك ٨ کلیچەی تیادابوو. سەمیرە چەند کلیچەی دروستکرد؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

٢٠ مازن چەند نەمامێکی لە شێوەی ڕیزکراوەی لە ٣ ڕیز چاند، لە هەر ڕیزێك ٩ نەمام. کام ڕستە ژمارەییە یارمەتی ئەنجامدانی ژمارەی نەمامەکان دەدات؟

أ ٩ – ٣ = ٦ ب ٣ + ٩ = ١٢ ج ٩ ÷ ٣ = ٣ د ٣ × ٩ = ٢٧

وانەی ٤

# ڕاهێنان لەسەر لێکدان



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ٥ × ٤ = ▢

٢ ٢ × ٨ = ▢

٣ ٤ × ٩ = ▢

٤ ٧ × ٨ = ▢

## فێربە

**مەلەوانی** هەر ڕاهێنەرێك ٦ منداڵ فێری مەلەوانی دەکات، لەهەر تیپێك ژمارەی ڕاهێنەرەکان ٧ بوون، ژمارەی منداڵەکان چەندبوون؟

٧ × ٦ = ▢

زۆر ڕێگا فێربووی بۆ هەژمێرکردنی ٧ × ٦.

**أ** ڕیزکراوەکە بەش بکە بۆ ڕاستییەکانی لێکدانی زانراو.




٢ × ٦ = ١٢




٥ × ٦ = ٣٠

١٢ + ٣٠ = ٤٢ کەواتە، ٧ × ٦ = ٤٢

**ب** خشتەی لێکدان بەکاربێنە.

| × | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ١ | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
| ٢ | ٠ | ٢ | ٤ | ٦ | ٨ | ١٠ | ١٢ | ١٤ | ١٦ | ١٨ |
| ٣ | ٠ | ٣ | ٦ | ٩ | ١٢ | ١٥ | ١٨ | ٢١ | ٢٤ | ٢٧ |
| ٤ | ٠ | ٤ | ٨ | ١٢ | ١٦ | ٢٠ | ٢٤ | ٢٨ | ٣٢ | ٣٦ |
| ٥ | ٠ | ٥ | ١٠ | ١٥ | ٢٠ | ٢٥ | ٣٠ | ٣٥ | ٤٠ | ٤٥ |
| ٦ | ٠ | ٦ | ١٢ | ١٨ | ٢٤ | ٣٠ | ٣٦ | ٤٢ | ٤٨ | ٥٤ |
| ٧ | ٠ | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ | ٣٥ | ٤٢ | ٤٩ | ٥٦ | ٦٣ |
| ٨ | ٠ | ٨ | ١٦ | ٢٤ | ٣٢ | ٤٠ | ٤٨ | ٥٦ | ٦٤ | ٧٢ |
| ٩ | ٠ | ٩ | ١٨ | ٢٧ | ٣٦ | ٤٥ | ٥٤ | ٦٣ | ٧٢ | ٨١ |

**ج** ئاڵوگۆڕ لە لێکدان بەکاربێنە.

هەوڵ بدە کۆلکەکان ئاڵوگۆڕ بکەیت

**بیربکەوە:** ئەگەر ٦ × ٧ = ٤٢

ئەوا ٧ × ٦ = ٤٢

کەواتە ژمارەی منداڵەکان ٤٢ منداڵە.

**د** ئەگەر یەکێك لە کۆلکەکان جووت بوو چەند جارە بەکاربێنە. ٦ کۆلکەیەکی جووتە

**بیربکەوە:** ٦ دوو ئەوەندەی ٣ یە ئەنجامی

٧ × ٣ = ٢١

کەواتە ٧ × ٦ = ٢١ + ٢١ = ٤٢

## ڕێگاکانی دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان

**ئەگەر هاتوو** ژمارەی ڕاهێنەرەکان ٨ و ژمارەی منداڵەکان ٥ بێت لە هەر تیپێك، ژمارەی هەموو منداڵەکان دەبێتە چەند؟

دونیا و دانا دوو ڕێگا جیاوازیان بەکارهێنا بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی ٨ × ٥

● ئەگەر ڕاستی لێکدانی ٨ × ٥ لەبیرت نییە.

کام ڕێگە بەکاردێنی؟

دونیا

بۆ ئەوە ژمارەیەك لە ٨ بدەم هەڵدەستم بە لێکدانی لە ٤ وە ئەنجام دوو ئەوەندە دەکەم.

| × | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٤ | ٠ | ٤ | ٨ | ١٢ | ١٦ | ٢٠ |

| × | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٨ | ٠ | ٨ | ١٦ | ٢٤ | ٣٢ | ٤٠ |

وە لەبەر ئەوەی ٤×٥=٢٠

ئەوا ٨ × ٥ = ٤٠

دانا

دەتوانم سیفەتی ئاڵوگۆڕ لە لێکدان بەکاربێنم.

لەبەر ئەوەی ٨ × ٥ = ٥ × ٨

وە لەبەر ئەوەی ٥ × ٨ = ٤٠

ئەوا ٨ × ٥ = ٤٠

## ساغبكەوە

١ ڕوونیبكەوە چۆن ڕاستی لێكدانی ٩ × ٥ = ٤٥ بەكاردێنیت بۆ دۆزینەوەی ٨ × ٥؟

٢ ڕوونیبكەوە چۆن دوو ئەوەندە بەكاردێنیت بۆ هەژمێركردنی ٦ × ٩؟

تەواوبكە.

٣ ٢ × ٥ = ▢ ٤ ٦ × ٦ = ▢ ٥ ٢ × ٢ = ▢

٦ ٥ × ٩ ٧ ٦ × ٣ ٨ ٣ × ٣

## ڕاهێنــان و شیـكاركـردنـی پـرسیـارەكـان

بەراورد بكە و هێمای > یان < یان = لە شێوەی ● دابنێ.

٩ ٤ × ٩ ● ٦ × ٦ ١٠ ٣ × ٦ ● ١٨

١١ ٨ × ٩ ● ٨ + ٩ ١٢ ٧ × ٧ ● ٥٠

بنووسە دروستە یان هەڵەیە لەناو لاكێشەكە، بەرامبەر هەر ڕاهێنانێك.

١٣ ٤ × ٦ = ٢٤ ▢ ١٤ ٨ × ٦ = ٤٠ ▢ ١٥ ٧ × ٧ = ٤٧ ▢

١٦ ٨ × ٨ = ٦٤ ▢ ١٧ ٥ × ٩ = ٥٥ ▢ ١٨ ٩ × ٩ = ٩٩ ▢

١٩ كاروان ٤ تێنووسی كڕی، هەر تێنووسێك بە ٣ هەزار دینار، كاروان چەندی داوە؟

٢٠ ئاراس ٨ هەفتەی لە بەغدا بەسەربرد، چەند ڕۆژی لە بەغدا بەسەر بردووە؟

٢١ **بیركردنەوەی ڕەخنەگر** سولاف وتی «ئەگەر هەر ژمارەیەك لە ٧ بدەی ژمارەیەكی تاكت دەستدەكەوێت» ئایا لە گەلیای؟ لەوەبكۆڵەوە.

٢٢ دوكاندارێك ٩ قاپی فرۆشت، نرخی هەر قاپێك ٦ هەزار دینار بوو و دۆڵكەیەكیش نرخەكەی ٤ هەزار دینار بوو. چەندی وەرگرتووە لە كڕیارەكە؟

٢٣ **پرسیار** مەحمود ماوەی ٩ هەفتەو ٤ ڕۆژ لە قاهیرە و بەیروت بەسەر برد، لە قاهیرە ٣٥ ڕۆژ مایەوە، چەند ڕۆژ لە بەیروت بەسەر بردووە؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

٢٤ هاوار ٣ جار لە هەفتەیەكدا مەشق دەكات لە میانەی ٩ هەفتە. هاوار دووجار نەهاتووە بۆ مەشقكردن. هاوار چەند جار مەشقیكردووە؟

أ ٣ ب ٢٤ ج ٢٥ د ٢٧

وانەی
**٥**

# ژمارەی نادیار



## پێداچوونەوەی خێرا

١) ٤ × ٦ = ▢  ٢) ٢ × ٧ = ▢

٣) ▢ = ٣ × ٠  ٤) ٦ × ١ = ▢



### فێربە

**پێشبڕکێ لە دروست کردنی شیرینی** ئازاد پێشبڕکێیەکی بردەوە. ٣٥ پارچە شیرینی دروست کرد و لە چەند قاپێکی دانا، لە هەر قاپێك ٥ پارچە. چەند قاپی بەکارهێنا؟

خشتەی لێکدان بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی کۆڵکەی نادیاری لێکدان.

▢ × ٥ = ٣٥

↑ ژمارەی قاپەکان ↑ ژمارەی پارچەکان لە هەر قاپێك ↑ ژمارەی هەموو پارچەکان

لە ستوونی ژمارە «٥» دەستپێبکە. سەیری ژمارەکانی ئەو ستوونە بکە تا ژمارە ٣٥ دەدۆزیەوە، پاشان سەیری ئەو ژمارەیە بکە کە لە ڕیزی ژمارە ٣٥ دایە.

کۆڵکەی نادیاری لێکدان دەکاتە ٧.

٧ × ٥ = ٣٥

↑ ژمارەی قاپەکان ↑ ژمارەی پارچەکان لە هەر قاپێك ↑ ژمارەی هەموو پارچەکان

کەواتە، ئازاد ٧ قاپی بەکارهێنا.

ستوون ← ٥ ، ڕیز ← ٧

| × | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ١ | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
| ٢ | ٠ | ٢ | ٤ | ٦ | ٨ | ١٠ | ١٢ | ١٤ | ١٦ | ١٨ |
| ٣ | ٠ | ٣ | ٦ | ٩ | ١٢ | ١٥ | ١٨ | ٢١ | ٢٤ | ٢٧ |
| ٤ | ٠ | ٤ | ٨ | ١٢ | ١٦ | ٢٠ | ٢٤ | ٢٨ | ٣٢ | ٣٦ |
| ٥ | ٠ | ٥ | ١٠ | ١٥ | ٢٠ | ٢٥ | ٣٠ | ٣٥ | ٤٠ | ٤٥ |
| ٦ | ٠ | ٦ | ١٢ | ١٨ | ٢٤ | ٣٠ | ٣٦ | ٤٢ | ٤٨ | ٥٤ |
| ٧ | ٠ | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ | ٣٥ | ٤٢ | ٤٩ | ٥٦ | ٦٣ |
| ٨ | ٠ | ٨ | ١٦ | ٢٤ | ٣٢ | ٤٠ | ٤٨ | ٥٦ | ٦٤ | ٧٢ |
| ٩ | ٠ | ٩ | ١٨ | ٢٧ | ٣٦ | ٤٥ | ٥٤ | ٦٣ | ٧٢ | ٨١ |

### نموونە

کۆڵکەی نادیار لە ٤ × ▢ = ١٢ چییە؟

لەڕیزی کۆڵکەی لێکدانی ٤ دەستپێبکە.
سەیری ژمارەکان بکە لەو ڕیزە تا ژمارەی ١٢ دەدۆزیەوە پاشان، سەیری ژمارە ١٢ بکە لەکام ستوونە. لە ستوونی ژمارە٣، کۆڵکەی نادیار دەکاتە ٣.  ٤× ٣ =١٢

ستوون ← ٣ ، ڕیز ← ٤

| × | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ١ | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
| ٢ | ٠ | ٢ | ٤ | ٦ | ٨ | ١٠ | ١٢ | ١٤ | ١٦ | ١٨ |
| ٣ | ٠ | ٣ | ٦ | ٩ | ١٢ | ١٥ | ١٨ | ٢١ | ٢٤ | ٢٧ |
| ٤ | ٠ | ٤ | ٨ | ١٢ | ١٦ | ٢٠ | ٢٤ | ٢٨ | ٣٢ | ٣٦ |
| ٥ | ٠ | ٥ | ١٠ | ١٥ | ٢٠ | ٢٥ | ٣٠ | ٣٥ | ٤٠ | ٤٥ |
| ٦ | ٠ | ٦ | ١٢ | ١٨ | ٢٤ | ٣٠ | ٣٦ | ٤٢ | ٤٨ | ٥٤ |
| ٧ | ٠ | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ | ٣٥ | ٤٢ | ٤٩ | ٥٦ | ٦٣ |
| ٨ | ٠ | ٨ | ١٦ | ٢٤ | ٣٢ | ٤٠ | ٤٨ | ٥٦ | ٦٤ | ٧٢ |
| ٩ | ٠ | ٩ | ١٨ | ٢٧ | ٣٦ | ٤٥ | ٥٤ | ٦٣ | ٧٢ | ٨١ |

**لە بیرمەکە** کاتێك ئەنجامی لێکدان و یەکێك لە دوو کۆڵکەی لێکدانی دەزانی، خشتەی لێکدان یارمەتیت دەدات بۆ دۆزینەوەی.

## ساغبکەوە

١ ڕوونیبکەوە چۆن خشتەی لێکدان بەکاردێنیت بۆ دۆزینەوەی کۆڵکەی نادیاری ☐ × ٦ = ١٨؟

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

کۆڵکەی نادیار چییە؟

٢ ☐ × ٤ = ١٢

٣ ١ × ☐ = ٩

٤ ☐ × ٢ = ١٨

٥ ☐ × ٤ = ٣٦

٦ ٤ × ٦ = ☐ × ٣

٧ ٩ × ☐ = ٥٠ − ٥

٨ ئەنجامی لێکدانی ٤ لە ژمارەیەکی تر دەکاتە ٢٨ ئەو ژمارەیە چییە؟

٩ ئالا ٣ کورسی بۆ هەر مێزێك لە هۆڵەکە دانا. ئایا ژمارەی مێزەکان چەندە ئەگەر ٢١ کورسی لە هۆڵەکەدابێت؟ ڕستەی لێکدان بۆ شیکاری پرسیارەکە بنووسە.

### خۆشی: لێکدان بە لێکدان

سەرنج لەم خشتەیەی خوارەوە بدە.

| | | |
|---|---|---|
| ٢ | ١ | ٢ |
| ٤ | ٥ | ٢٠ |
| ٨ | ٥ | ٤٠ |

- لەهەر ڕیزێك، ئەگەر ژمارەی یەکەم جارانی ژمارەی دووەم بکەی، ژمارەی سێیەمت دەستدەکەوێت.
- لەهەر ستوونێك ئەگەر ژمارەی یەکەم جارانی ژمارەی دووەم بکەی، ژمارەی سێیەمت دەستدەکەوێت.
- ژمارەی یەکەم لە ڕیزی یەکەم «١» نییە.

بۆیە چوارگۆشەیەکی وەها پێیدەوترێت «لێکدان بە لێکدان».

هەر یەك لەم خشتانە تەواوبکە بۆ ئەوی چوارگۆشەی «لێکدان بە لێکدان»ت دەستبکەوێت.

١٠

| | | |
|---|---|---|
| ٣ | ٥ | |
| | | ٢ |
| | ٥ | |

١١

| | | |
|---|---|---|
| ٢ | | |
| ٤ | ٧ | |
| | | ٥٦ |

١٢

| | | |
|---|---|---|
| ٥ | | ١٥ |
| | | |
| | | ٣٠ |

١٣

| | | |
|---|---|---|
| ٣ | | |
| | ٧ | |
| | | ٤٢ |

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

١٤ ژمارەی نادیار چییە؟

٦ × ☐ = ٤٢؟

أ ٤ ب ٢ ج ٧ د ٨

وانەی
٦

# ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان

## وێنەیەك بکێشە



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ٢ × ٨ = ▢

٢ ٨ × ▢ = ٢٤

٣ ٦٤ = ٨ × ▢

٤ ▢ × ٨ = ٣٢

**پرسیار** نەنکی یارا ١٦ چوارگۆشەی بچووکی لە خوری چنی. چۆن دەتوانێ ئەو چوارگۆشانە بچنێ بۆ پێك هێنانی سەرپۆشێك هەمان ژمارەی چوارگۆشەی هەبێت لە درێژی و لە پانی؟



### تێبگە

- داواکراو چییە؟
- ئەو پێدراوانەی بەکارت هێناوە چییە؟
- ئایا پێدراوی تر هەیە بەکارت نەهێنابێت؟

### پلاندانی

- کام ڕێگە بەکاردێنیت بۆ شیکارکردنی پرسیارەکان؟
  دەتوانی ڕێگەی «وێنەیەك بکێشە» بەکاربێنی بۆ دۆزینەوەی شیکارەکە.

### شیکاریکە

- چۆن ئەو ڕێگایە بەکاردێنی لە شیکارکردنەکە؟

٣ چوارگۆشە بە درێژی و ٣ چوارگۆشە بە پانی تاقی بکەوە.



٣ × ٣ = ٩

ئەو شیکارە تەنها ٩ چوارگۆشەی بەکارهێنا.

٤ چوارگۆشە بە درێژی و ٤ چوارگۆشە بە پانی تاقی بکەوە.



٤ × ٤ = ١٦

ئەو شیکارە ١٦ چوارگۆشەی بەکارهێنا.

کەواتە، نەنکی یارا پشتی بە شێوەی دووەمی بەست و چوارگۆشەکانی دووری، سەرپۆشەکەی دروستکرد.

### ساغبکەوە

- لە پرسارەکە ووردبەوە. ڕوونیبکەوە لەبەرچی شێوەی دووەمی هەڵبژارد.

## ڕاهێنــان و شیكــاركــردنــی پرسیــارەكــان

ڕێگەی «وێنەیەك بكێشە» بەكاربێنەبۆ شیكاركردنی پرسیارەكان لە ١ تا ٤.

١ ئەگەر ژمارەی چوارگۆشەكان ٢٥ بوو، چۆن دەتوانی ئەو چوارگۆشانە لەگەڵ یەكتری بدووری بۆ ئەوەی هەمان ژمارەی چوارگۆشەت دەست كەوێ لە درێژی وپانی؟

٢ دایكی مازن ٣٢ چوارگۆشەی بچووكی لە خوری چنی، پێویستە چەند چوارگۆشەی زیاد بچنی بۆ ئەوەی ژمارەی چوارگۆشەكان لەگەڵ یەكتری هەمان ژمارەی هەبێت لە درێژی و لە پانی؟



ژمارەی نەوەكانی خەسرەو ٢٤.
دەیەوێت وێنەكانیان لەسەر دیوار هەڵواسێت.

٣ كام لەم شیكارانەی دێت گونجاو نییە؟

أ ٣ ڕیز لە ٨ ج ٤ ڕیز لە ٦
ب ٦ ڕیز لە ٤ د ٤ ڕیز لە ٨

٤ باپیرە بڕیاری دا ٤ وێنە لەهەر ڕیزێك دابنێ، چەند ڕیزی پێویستە بۆ دانانی ٢٤ وێنە؟

أ ٣ ب ٤ ج ٦ د ٨

### ڕێگەكانی شیكاركردنی پرسیار

**هێڵكاریەك یا وێنەیەك بكێشە**

شێوازێك دروستبكە یان بەكردار جێبە جێبكە
لیستێكی ڕێك دروست بكە
بەدوای شێوازێك بگەڕێ
خشتەیەك یان وێنەیكی ڕوونكردنەوەیی دروستبكە.
بخەملێنە وساغبكەوە
بە هەنگاوەكاندا بگەڕێوە
پرسیاری ئاسانتر شیكاربكە
ڕستەیەكی ژمارەیی بنووسە.
دەرئەنجام ژیربێژی بەكاربێنە

## ڕاهێنان لەسەر ڕێگا جیاوازەكان

ستوونی ڕوونكردنەوەیی بەرامبەر بەكاربێنە بۆ شیكاركردنی ڕاهێنانی ٥ تا ٧.

٥ ٣ بۆق لە گۆمەكە ڕۆیشتن چەند گیانلەبەر مانەوە؟

٦ ٨ مراوی گۆمەكەیان بەجێ هێشت، دوو قاز هاتن. بوونە چەند قاز ومراوی لە گۆمەكەدا.

٧ ٥ بۆق هاتن بۆ گۆمەكە. ژمارەی گیانەوەرەكان بوون بە چەند؟



بەشی ٥

# پێداچوونەوە

## دڵنیابوون لە زاراوەکان و چەمکەکان

ڕێگایەك بڵێ بۆ بەشکردنی ڕیزکراوەکە، پاشان ئەنجامی لێکدان بنووسە.




٤ چۆن ڕاستی لێکدانی ٦ × ١٠ = ٦٠ بەکاردێنیت بۆ هەژمێرکردنی ٦ × ٩؟

## دڵنیابوون لە کارامەییەکان

لێکبدە.

٥ ٦ × ٧ = ▢

٦ ٧ × ٨ = ▢

٧ ٨ × ٥ = ▢

٨ ٦ × ٠ = ▢

٩ ٦ × ٦ = ▢

١٠ ٨ × ٩ = ▢

١١ ٦ × ٩ = ▢

١٢ ١٠ × ٥ = ▢

١٣ ٨ × ٨

١٤ ٨ × ٤

## دڵنیابوون لە شیکارکردنی پرسیارەکان

شیکارکردنی پرسیارەکان.

١٥ لە سندوقێك دوو ڕیز سێو هەیە لەهەر ڕیزێك ٦ سێو، ڕێگایەکی تر دیاربکە بۆ ڕیزکردنی سێوەکان لەچەند ڕیزێکی یەکسان.

١٦ هێرش پاکەتێکی کڕی ٣ ڕیز شیرینی تێدابوو. لەهەر ڕیزێك ٤ دانە، ٨ دانەی خوارد. چەند دانە ماوەتەوە؟

١٧ هۆزان ٤٩ پارچە قوماشی چوارگۆشەیی کڕی، بەیەکەوە دووری بۆ دەست کەوتنی چەند چوارگۆشە کە هەمان درێژی و پانی هەبێت. ئەو ژمارەیە چەندە؟

١٨ لە تێنووسی ئازاد ٦ ڕیزی یەکسان لە پوول هەیە، ٣ پوولی نوێی کڕی. هەموو بوونە ٣٣ پوول. چەند پوول هەبوون لەهەر ڕیزێك؟

بەشی ٥

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**ئاگاداربە!**

- هەموو ناوەڕۆکەکە بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت لە پرسیار.
- وەڵامەکانت ساغبکەوە.

**وەڵامی گونجاو دەوربدە لە ڕاهێنانی ١ تا ٩.**

**١** خوناو چەند تۆپێکی ڕەنگاوڕەنگی دروستکرد. لە پاکەتێکی دانا بە ٦ ڕیز و هەر ڕیزێك ٥ تۆپی دانا، چەند تۆپی لە پاکەتەکە دانا؟

أ ٣٠ ب ٢٥ ج ٢٤ د ١١

**٢** شۆخان پشووی بەسەر برد کە ٤ هەفتە بوو. ژمارەی ڕۆژەکانی پشووەکە چەندە؟

أ ٣٠ ب ٢٨ ج ٢٤ د ٢٠

**٣** ئەو ژمارەی کە ڕستەی ژمارەیی ٧ × ▢ = ٤٢ ڕاست دەکات چەندە؟

أ ٥ ب ٦ ج ٧ د ٨

**٤** کام لەوانەی دێت شێوەیەکی ترە بۆ نووسینی ٧ + ٧ + ٧؟

أ ٧ × ٧ ب ٣ × ٧ ج ٢١ × ٣ د ٣ + ٧

**٥** ٨ × ٨ = ▢

أ ٥٦ ب ٧٢ ج ٦٤ د هیچ لەوانە

**٦** بەڕێز پێویستی بە ٥٩ هەزار دینار هەیە بۆ کڕینی پێنووس ٨٥ هەزار دیناری بۆ تێنووس و ٢٩ هەزار دینار بۆ ڕاستە، چەند هەزاری پێویستە؟

أ ١٧٣ ب ٢٢٧ ج ٣٢٧ د ٤٧٣

**٧** ٩ قوتابی هەریەکەیان ٦ کتێبی کڕی، هەموویان چەند کتێبیان کڕی؟

أ ١٥ ب ٣٦ ج ٤٥ د ٥٤

**٨** ڕابەری تیپی دێدەوانی ٤ پیتزای کڕی، هەر یەکەیانی بەشکرد بۆ ١٠ پارچەی یەکسان. پارچەکانی دابەشکرد بەسەر ئەندامی تیپەکەوە ودوو پارچەی مایەوە. چەند پارچەی دابەشکردووە؟

أ ١٦ ب ٢٠ ج ٣٨ د ٤٢

**٩** دانا ٣ کتێبی فرۆشت، دەوەن ٤، بەهای هەر یەکەیان ٦ هەزار دینارە. بەهەردووکیان چەند پارەیان کۆکردۆتەوە؟

أ ٤٩ ب ٤٢ ج ١٣ د ٧

## ئەوەی دەیزانی بینووسە

**١٠** کاتیا ٢١ چواگۆشەی بچووکی لە خوری چنی و دەیویست شالێکی چوارگۆشەیی دروست بکات، چەند چوارگۆشەی بچووکی تر دەبێت بچنێت؟

بەشی ٦

# دابەشکردن

منداڵەکان ئەو کارتانەی وێنەی پاڵەوانانی وەرزشیان پێوەیە دەگۆڕنەوە. لە ئەلبومەکانیان ڕیکیان دەخەن.

**پرسیار بۆ شیکارکردن:** سەیری وێنەداری ڕوونکردنەوەیی بکە. ئەگەر لەهەر ئەلبومێك ٤ کارت دانرا. هەرمنداڵێك چەند ئەلبومی دەوێ؟

| کۆمەڵەی کارتەکان | |
|---|---|
| گۆڤان | ▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮ |
| جەمال | ▮▮▮▮▮▮▮▮ |
| ئارام | ▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮ |
| نەوژین | ▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮ |
| ژین | ▮▮▮▮▮▮▮▮▮▮ |
| ▮ = ٢ کارت | |

# زانیارییەکانت ساغبکەوە



ئەم لاپەڕەیە بەکاربهێنە بۆ دڵنیابوون لە هەبوونی
ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە لەم بەشەدا

## زاراوەکان

دەربڕینێکی گونجاو لە لیستی بەرامبەر هەڵبژێرە.

| |
|---|
| کۆڵکەی لێکدان |
| ئەنجامی لێکدان |
| سەرجەم |

**١** ژمارە ٢٤ لە ڕستەی لێکدانی ٦ × ٤ = ٢٤
پێی دەوترێت ___؟___ .

**٢** ژمارەی ٥ لە ڕستەی لێکدانی ٥ × ٣ = ١٥
پێی دەوترێت ___؟___ .

## واتای لێکدان

کۆپی بکەو پاشان تەواو بکە.

**٣**



أ ▢ کۆمەڵە لە ▢

ب ▢ + ▢ + ▢ = ▢

ج ▢ × ▢ = ▢

**٤**



أ ▢ کۆمەڵە لە ▢

ب ▢ + ▢ = ▢

ج ▢ × ▢ = ▢

ڕستەیەکی کۆکردنەوە و ڕستەیەکی لێکدان بۆ هەر وێنەیەك بنووسە.

**٥**



**٦**



## ڕاستییەکانی لێکدان

لێکبدە.

**٧** ٦ × ٧ = ▢

**٨** ٣ × ٨ = ▢

**٩** ▢ = ٨ × ٩

**١٠** ▢ = ٩ × ٨

**١١** ▢ = ٦ × ٨

**١٢** ٨ × ٧ = ▢

وانەی ١

پەدەستی

# واتای دابەشکردن



## پێداچوونەوەی خێرا

١ ٦ × ٤ = 

٢ ٣ × ٥ = 

٣ ٢ × ٦ = 

٤ ٧ × ٣ = 

## زاراوەکان

دابەشکردن هێمای دابەشکردن

کەرستەکان پەپکی بچووک

## بـــدۆزەوە

کاتێ لێکدەدەیت، کۆمەڵە یەکسانەکان دەخەیتە پاڵ یەك، وە کاتێ **دابەشدەکەیت**، هەڵدەستین بە بەشینەوە بۆ کۆمەڵەکانی یەکسان.

## چالاکی

ئەگەر ١٤ پەپك بەشبکەین بۆ دوو کۆمەڵەی یەکسان، ژمارەی پەپکەکان لەهەر کۆمەڵێك چەند دەبێ؟

**هەنگاوی ١**

١٤ پەپك بەکاربێنە. دوو بازنە بکێشە.



**هەنگاوی ٢**

پەپکێك لەهەر بازنەیەك دابنێ.



**هەنگاوی ٣**

کردارەکە دووبارە بکەوە تا پەپك نامێنێت.



کەواتە. هەر کۆمەڵەیەك ٧ پەپکی تێدایە.

ئەوەی پێی هەڵسای **دابەشکردنی** ١٤یە بەسەر ٢. بنووسە: ١٤ ÷ ٢ = ٧

بخوێنەوە: ١٤ دابەش ٢ یەکسانە بە ٧.

یان ١٤ لەسەر ٢ یەکسانە ٧.

بە هێمای ÷ دەوترێت هێمای **دابەشکردن**.



٢٠ پەپك بەش دەکەین بەسەر ٥ کۆمەڵەی یەکسان چەند پەپك لەهەر کۆمەڵەیەکدا هەیە؟

## هەوڵبدە

**پەپکەکان بەکاربێنە بۆ دروستکردنی کۆمەڵە یەکسانەکان**

أ ٢٠ پەپك بەشبکە بۆ ٥ کۆمەڵەی یەکسان. چەند پەپك لەهەر کۆمەڵەیەك هەیە؟

ب ١٢ پەپك بەشبکە بۆ کۆمەڵەی یەکسان بە چەند ڕێگایەك.

ج چەند کۆمەڵەت دەست کەوت لەهەر ڕێگەیەك؟

## بـبـەسـتـەوە

**لەبیرمەکە** لەکاتی بەشینەوە بۆ کۆمەڵەکانی یەکسان، دابەشکردن بەکاردێنیت بۆ دۆزینەوەی ژمارەی شتەکان لەهەر کۆمەڵەیەك، یان بۆ دۆزینەوەی ژمارەی کۆمەڵەکان.

٤ برادەر ٢٠ هەڵماتی ڕەنگاوڕەنگیان بەیەکسانی لە نێوان خۆیان بەشکرد. بەشی هەریەکەیان چەندە؟



هەڵماتێك لەهەر بازنەیەك دابنێ تا هیچ هەڵمات نەمێنێ. هەر برادەرێك ٥ هەڵماتی دەست دەکەوێ.

هەر منداڵێك ٤ شەکرۆکەی دەوێت. چەند منداڵ دەتوانن ٢٠ شەکرۆکە بەیەکسانی بەش بکەن بەسەر خۆیاندا؟



کۆمەڵە دروست بکە لە ٤ شەکرۆکە تا هیچ شەکرۆکە نەمێنێ، ٥ کەس دەتوانن شەکرۆکەکان بەیەکسانی بەش بکەن لە نێوان خۆیان.

## سـاغـبـکـەوە

**١** ٣ برا ١٥ پێنووسیان بەسەر یەکا بە یەکسانی دابەشکرد، هەریەکەیان چەندی بەردەکەوێ؟

**٢** ژمارەیەك قوتابی ٢٤ پارچە حەلوایان بەسەر خۆیان بەیەکسانی دابەشکرد، هەریەکەیان ٤ پارچە حەلوای بەرکەوت، ژمارەی قوتابییەکان چەندە؟

## ڕاهێـنـان و شیـکـارکـردنـی پـرسـیـارەکـان

پەیك بەکاربێنە تا یارمەتیت بدات بۆ تەواوکردنی خشتەکان.

| | ژمارەی پەیك | ژمارەی کۆمەڵە یەکسان | ژمارەی پەیك لەهەر کۆمەڵەیەك |
|---|---|---|---|
| ٣ | ١٥ | ٥ | |
| ٤ | ٢١ | | ٣ |
| ٥ | ٢٤ | ٣ | |
| ٦ | ٢٨ | | ٧ |

پەیك بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانەکان لە ٧ تا ٩.

**٧** ٥ هاوڕێ ٣٠ پێنووسیان بە یەکسانی بەشکرد. بەشی هەر یەکەیان چەند پێنووس بوو؟

**٨** **بنووسە** چۆن ٣٢ پەیك بەش دەکەی بۆ چوار کۆمەڵەی یەکسان؟

**٩** سۆلین دەیەوێت ١٨ پەرتووك لەسەر چەند ڕەفەیەك بە یەکسانی ڕێك بخات. ٣ ڕێگا بڵێ بۆ ئەو کارە؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٠** دانا ٢٤ سێوی بۆ ٤ کۆمەڵەی یەکسان دابەشکرد. چەند سێوی لەهەر کۆمەڵەیەکدا داناوە؟

أ ٤    ب ٦    ج ٧    د ٢٠

وانەی ٢

# دابەشکردن و لێکدان

## فێربە

**پوولەکان** ئەوەی لە لێکدان و ڕیزکراوەکان فێربوویت بەکاردەهێنی بۆ تێگەیشتنی دابەشکردن. سیروان ١٨ پوولی پۆستەی کڕی لە تێنووسێکی تایبەتی دانا. پوولەکانی بە یەکسانی لەسەر ٣ ڕیز دابەشکرد. لەهەر ڕیز چەند پوولی دانا؟

١٨ ÷ ٣ = ▢

ژمارەی پوولەکان ← ١٨ ، ژمارەی ڕیزەکان ← ٣ ، ژمارەی پوولەکان لەهەر ڕیزێك ← ▢

بۆ شیکاری پرسیارەکە، ڕیزکراوەیەك پێك بێنە لە ١٨ پەپك و لە ٣ ڕیزی یەکسان، لە پاشان پەپکەکان لەهەر ڕیزێك بژمێرە. لەبەر ئەوەی ٣ × ٦ = ١٨، ئەوا ١٨ ÷ ٣ = ٦.



٣ ڕیز لە ٦ = ١٨

١٨ ÷ ٣ = ٦

بەشکراو ← ١٨ ، بەشدراو ← ٣ ، ئەنجامی دابەشکردن ← ٦

٣ ⟌ ١٨ ، ئەنجامی دابەشکردن: ٦ ، بەشدراو: ٣ ، بەشکراو: ١٨

کەواتە لەهەر ڕیزێك ٦ پوول هەیە.

**لەبیرمەکە** لێکدان و دابەشکردن **دوو کرداری پێچەوانەن**.

### نموونە

| أ | ب | ج |
|---|---|---|
| ٤ ڕیز لە ٣ = ١٢ | دوو ڕیز لە ٧ = ١٤ | ٣ ڕیز لە ٥ = ١٥ |
| ١٢ ÷ ٤ = ٣ | ١٤ ÷ ٢ = ٧ | ١٥ ÷ ٣ = ٥ |

### پێداچوونەوەی خێرا

١) ٢ × ٧

٢) ٤ × ٢

٣) ٢ × ٩

٤) ٣ × ٨

### زاراوەکان

بەشدراو

بەشکراو

ئەنجامی دابەشکردن

دوو کرداری پێچەوانە

## ساغبکەوە

١ چۆن ڕیزکراوەکان بەکاردێنی بۆ لێکدان یان دابەشکردن؟

**تەواو بکە.**

٢

٣ ڕیز لە ☐ = ٢٤
٢٤ ÷ ٣ = ☐

٣

دوو ڕیز لە ☐ = ١٨
١٨ ÷ ٢ = ☐

٤

٣ ڕیز لە ☐ = ١٨
١٨ ÷ ٣ = ☐

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

**تەواو بکە.**

٥

٣ ڕیز لە ☐ = ٢١
٢١ ÷ ٣ = ☐

٦

٥ ڕیز لە ☐ = ٣٠
٣٠ ÷ ٥ = ☐

٧

٥ ڕیز لە ☐ = ٤٠
٤٠ ÷ ٥ = ☐

**ڕستەی ژمارەیی تەواو بکە. ڕیزکراوەیەك بکێشە بۆ هاریکاری کردنت.**

٨ ٣ × ☐ = ١٨ ١٨ ÷ ٣ = ☐

٩ ٦ × ☐ = ٢٤ ٢٤ ÷ ٦ = ☐

**تەواو بکە.**

١٠ ١٢ ÷ ٢ = ☐

١١ ٢٥ ÷ ٥ = ☐

١٢ ٣ × ☐ = ٢١

جەبر **تەواو بکە.**

١٣ ٤ × ٢ = ٢٤ ÷ ☐

١٤ ☐ × ٣ = ٣٠ ÷ ٥

١٥ ٤ × ١ = ☐ ÷ ٤

١٦ کاوە ١٢ پوولی ڕێکخست لە چەند ڕیزێکی یەکسان لەهەر یەکەیان ٣ پوول، ژمارەی ڕیزەکان چەندە؟

١٧ شێروان ١٨ مۆمی کڕی لەناو چەند پاکەتێك. هەر پاکەتی ٦ مۆمی لەناوبوو، چەند پاکەتی کڕی؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

١٨ لاوین ٢٤ ئۆتۆمبیلی بچووکی خستە ناو ٣ پاکەتەوە. چەند ئۆتۆمبیلی لەناو دوو پاکەت دانا؟

أ ٦ ب ٨ ج ١٦ د ١٨

وانەی ٣

# ڕاستییە بەیەکەوە بەستراوەکان



## پێداچوونەوەی خێرا

١) ٣ × ☐ = ١٨

٢) ☐ × ٦ = ١٨

٣) ١٨ ÷ ٦ = ☐

٤) ٥ × ☐ = ٢٥

## زاراوەکان

ڕاستی لێکدان

ڕاستی دابەش

ڕاستییە بەیەکبەستراوەکان

## فێربە

**ڕاستییەکانی خۆشی** ڕستەی لێکدانی ٣ × ٥ = ١٥ پێی دەوترێ **ڕاستی** لێکدان. دەتوانی ڕستەیەکی ژمارەیی تر بنووسی ئەو ژمارانەی لەخۆ بگرێ ٣، ٥، ١٥. دەتوانی بنووسی:

٣ × ٥ = ١٥      ١٥ ÷ ٥ = ٣

٥ × ٣ = ١٥      ١٥ ÷ ٣ = ٥

ئەو ڕستە ژمارەییانە پێیان دەوترێ **ڕاستییەکانی بەیەکەوەبەستراو** بۆ ژمارەکانی ٣، ٥، ١٥ یان **ڕاستییەکانی لێکدان** و **دابەشکردن** بۆ ژمارەکانی ٣، ٥، ١٥.

## چالاکی

بەدەستی

**کەرستەکان:** پارچە کاغەزی چوار گۆشەیی و مقەست.

سێگۆشەکان بەکاردێن بۆ نووسینی ڕاستییەکانی لێکدان و دابەشکردن. ئەو سێگۆشانە پێیان دەوترێت **سێگۆشەکانی ڕاستییەکان**. کۆمەڵێك سێگۆشەی ڕاستی دروستبکە، وە بەکاریان بێنە بۆ نووسینی ڕاستییەکانی بەیەکەوە بەستراو.




أ) هەر یەك لە پارچە کاغەزەکان لە ناوەڕاستەوە سێ جار بنوشتێنەوە. کاغەزەکە بکەوە وە بیبڕە لە هێڵەکانی نووشتاندنەوە بۆ ئەوەی سێگۆشەکانت دەستکەوێ.




ب) سێگۆشەی ڕاستییەکان دروستبکە بۆ هەر یەکە لە ئەنجامەکانی لێکدانی دێت: ١٢، ١٥، ١٨، ٢٠، ٢٤، ٢٥، ٣٠.

ج) ڕاستییەکانی بەیەکەوە بەستراو بۆ سێ لەم سێگۆشانە بنووسە.



• **دەرئەنجام** چەند سێگۆشەی ڕاستییەکان دروستدەکرێ بۆ ئەنجامی لێکدانی ١٢؟ ڕوونیبکەوە.

## بەکارهێنانی خشتەی لێکدان

### نموونە

أ ئەنجامی دابەشکردنی بدۆزەوە

لە ١٢ ÷ ٣ = ▢

بیربکەوە: ٣ × ▢ = ١٢

بەدوای ڕیزی ژمارە ٣ لە خشتەی لێکدان بگەڕێ.

سەیری ژمارەکان بکە تا ژمارە ١٢ دەدۆزیەوە.

سەیری ئەو ژمارەیە بکە لەو ستونەی کە ژمارە ١٢ تێدایە.

ئەو ژمارەیە کۆلکەی لێکدانی نادیارە ٣ × ٤ = ١٢

کەواتە، ١٢ ÷ ٣ = ٤

ب بەشدراو چییە لە

٣٠ ÷ ▢ = ٥ ؟

بیربکەوە: ▢ × ٥ = ٣٠

بەدوای ستونی ژمارە ٥ لە خشتەی لێکدان بگەڕێ.

سەیری ژمارەکان بکە تا ژمارە ٣٠ دەدۆزیەوە.

سەیری ئەو ژمارەیە بکە کە لەو ڕیزەی کە ژمارە ٣٠ تێدایە.

ئەو ژمارەیە نادیارە کۆلکەی لێکدانی ٦ × ٥ = ٣٠

کەواتە، ٣٠ ÷ ٦ = ٥

**لەبیرت بێ**

٣ × ٤ = ١٢

کۆلکەی لێکدان ← ٣، کۆلکەی لێکدان ← ٤، ئەنجامی لێکدان ← ١٢

| × | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ١ | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ |
| ٢ | ٠ | ٢ | ٤ | ٦ | ٨ | ١٠ | ١٢ |
| ٣ | ٠ | ٣ | ٦ | ٩ | ١٢ | ١٥ | ١٨ |
| ٤ | ٠ | ٤ | ٨ | ١٢ | ١٦ | ٢٠ | ٢٤ |
| ٥ | ٠ | ٥ | ١٠ | ١٥ | ٢٠ | ٢٥ | ٣٠ |
| ٦ | ٠ | ٦ | ١٢ | ١٨ | ٢٤ | ٣٠ | ٣٦ |

**لەبیرمەکە** دەتوانی ڕاستیەکانی لێکدان و دابەشکردن بەیەك بەستراو بەکاربێنی بۆ دۆزینەوەی ژمارە نادیارەکە لە ڕستەی دابەشکردن.

- **دەرئەنجام** چۆن لێکدان بەکاردێنی بۆ ساغکردنەوەی ٢٠ ÷ ٤ = ٥؟

### ساغبکەوە

١ چۆن خشتەی لێکدان بەکاردێنی بۆ ئەوەی ڕوونیبکەیەوە کە ٥ × ٢ = ١٠ و ١٠ ÷ ٢ = ٥ دوو ڕاستی بەیەکەوە بەستراون.

**ژمارەی نادیار لەهەریەك لە سێگۆشەی ڕاستییەکان بنووسە.**

٢



٣



٤



٥



**ڕاستییەکانی بەیەکەوە بەستراو بۆ ئەو ژمارانە بنووسە.**

٦ ٣، ٦، ١٨

٧ ٣، ٧، ٢١

## ڕاهێنــان و شیـكـاركــردنـی پـرسـیــارەكــان

ژمارەی نادیار لەهەر یەكە لە سێگۆشە ڕاستییەكان بنووسە.

**٨**




**٩**




ڕاستییەكانی بەیەكەوە بەستراو بنووسە كە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم ژمارانە.

**١٠** ٥، ٦، ٣٠ **١١** ٢، ٨، ١٦ **١٢** ٥، ٥، ٢٥

ڕاستییەكانی تری بەیەكەوە بەستراو لە هەر یەك لەوانەی دێت بنووسە.

**١٣** ٣ × ٧ = ٢١ **١٤** ١ × ٥ = ٥ **١٥** ٥ × ٣ = ١٥



تەواو بكە.

**١٦** ▢ ÷ ٥ = ٦ + ٣ **١٧** ٦ × ▢ = ٥٤ ÷ ٩ **١٨** ٤٢ − ٦ = ▢ × ٩

**١٩** تێبینی چی دەكەی دەربارەی ڕاستییەكانی بەیەكبەستراو كە پەیوەستە بە ژمارەكانی ٦، ٦، ٣٦؟

**٢٠** **ڕێنوێنی** بە چ هەردوو ڕستە پێك دەچن؟ ٢٠ ÷ ٥ = ٤ و ٢٠ ÷ ٤ = ٥ وە بە چ جیاوازن؟

**٢١** لە فرۆشگایەكی ئاژەڵان قاپی ئاو وقاپی خواردن بۆ هەریەكە لە پشیلەو سەگ هەیە. لە فرۆشگاكە ٥ سەگ و ٤ پشیلە هەیە، ژمارەی قاپەكانی ئاو و ژماری قاپەكانی خواردن چەندە؟

## شیكاركردنی پرسیارەكان



## مشك و پەنیر



**شیكاركردنی مەتەڵ** لێك بدە.

| ن ٦ × ٣ | ر ٦ × ٥ | خ ٥ × ٧ | ٣ × ٤ |
|---|---|---|---|
| ي ٩ × ٥ | پ ٢ × ٧ | ٨ × ٧ | ۆ ٣ × ٢ |

| | | |
|---|---|---|
| ز ٨ × ٢ = ▢ | ك ٢ × ٢ = ▢ | ٢ × ٤ = ▢ |
| ش ٧ × ٣ = ▢ | ـە ٩ × ٣ = ▢ | ٥ × ٨ = ▢ |

بۆ شیكاركردنی مەتەڵەكە. لەسەر هەر ژمارەیەك ئەو پیتە دابنێ كە یەكسانە بە ئەنجامی لێكدانەكە.

مشكەكە چی دەڵێ؟

؟/١٤ ؟/٢٧ ؟/١٨ ؟/٤٥ ؟/٣٠  ؟/٢٧ ؟/٤ ؟/٢٧  ؟/٣٥ ؟/٦ ؟/٢١ ؟/٢٧



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ▢ × ٣ = ١٨

٢ ٤ × ▢ = ١٢

٣ ▢ × ٤ = ١٦

٤ ٤ × ▢ = ٣٢

وانەی ٤

# ڕاستییەکانی دابەشکردن تا ٥

## فێربە

**سەوڵ لێدان وەرزشێکی خۆشە** تیپی دیدەوان دەیەوێت چەند بەلەمێك بەکرێ بگرێت بۆ گەشتێکی دەریایی. ژمارەی دێدەوانەکانی ٢٤، هەربەلەمێك ٣ کەس هەڵدەگرێت. چەند بەلەم پێویستە؟

٢٤ ÷ ٣ = ▢

بۆ شیکارکردنی ئەم پرسیارە، ڕاستی لێکدانی بەیەکبەستراوی بەکاربێنە

**بیربکەوە:** ٣ × ▢ = ٢٤

٣ × ٨ = ٢٤ کەواتە ٢٤ ÷ ٣ = ٨ یان ٣⟌٢٤ = ٨

کەواتە، تیپەکە ٨ بەلەمی پێویستە.

چی دەبێت ئەگەر هەر بەلەمێك ٤ کەس هەڵبگرێت؟

٢٤ ÷ ٤ = ▢

**بیربکەوە:** ٤ × ▢ = ٢٤

٤ × ٦ = ٢٤ کەواتە ٢٤ ÷ ٤ = ٦ یان ٤⟌٢٤ = ٦

ئەو کاتە تیپەکە ٦ بەلەمی پێویستە.

چی دەبێت ئەگەر ژمارەی دێدەوانان ٢٠، وە هەر بەلەمێك ٥ کەس هەڵبگرێت؟

٢٠ ÷ ٥ = ▢

**بیربکەوە:** ٥ × ▢ = ٢٠

٥ × ٤ = ٢٠ کەواتە ٢٠ ÷ ٥ = ٤ یان ٥⟌٢٠ = ٤

ئەو کاتە تیپەکە ٤ بەلەمی پێویستە.

چی دەبێت ئەگەر ژمارەی دێدەوان ١٦. وهەر بەلەمێك دووکەس هەڵبگرێت؟

١٦ ÷ ٢ = ▢

**بیربکەوە:** ٢ × ▢ = ١٦

٢ × ٨ = ١٦ کەواتە ١٦ ÷ ٢ = ٨ یان ٢⟌١٦ = ٨

ئەوکاتە تیپەکە پێویستی بە ٨ بەلەم هەیە.

| × | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ١ | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
| ٢ | ٠ | ٢ | ٤ | ٦ | ٨ | ١٠ | ١٢ | ١٤ | ١٦ | ١٨ |
| ٣ | ٠ | ٣ | ٦ | ٩ | ١٢ | ١٥ | ١٨ | ٢١ | ٢٤ | ٢٧ |
| ٤ | ٠ | ٤ | ٨ | ١٢ | ١٦ | ٢٠ | ٢٤ | ٢٨ | ٣٢ | ٣٦ |
| ٥ | ٠ | ٥ | ١٠ | ١٥ | ٢٠ | ٢٥ | ٣٠ | ٣٥ | ٤٠ | ٤٥ |



**لەبیرمەکە** بۆ ئەوەی دابەش بکەی، دەتوانی کۆڵکەی لێکدانی نادیار بدۆزیەوە لە ڕاستی لێکدانی بەیەکبەستراوی ئەو پرسیارە.

- **گفتوگۆ** چۆن ٢ + ٢ + ٢ = ٦ بەکاردێنێت بۆ هەژمێرکردنی ٦ ÷ ٢؟
- **دەرئەنجام** چۆن ٢١ ÷ ٣ = ٧ بەکاردێنێت بۆ هەژمێرکردنی ٢٤ ÷ ٣؟

## ساغبکەوە

١ ڕوونیبکەرەوە چۆن لێکدان بەکاردێنیت بۆ ساغکردنەوەی ٢٠ ÷ ٥ = ٤؟

٢ ڕوونیبکەرەوە چۆن لێکدان بەکاردێنیت بۆ هەژمێرکردنی ١٢ ÷ ٤؟

کۆپی بکە پاشان تەواو بکە.

٣

| ÷ | ٢ | ٤ | ٦ | ٨ |
|---|---|---|---|---|
| ٢ | | | | |

٤

| ÷ | ١٠ | ١٥ | ٢٠ | ٢٥ |
|---|---|---|---|---|
| ٥ | | | | |

ڕاستییەکی لێکدان بنووسە کە دەتوانرێ بەکاربێت بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی دابەشکردن، لە پاشان ئەنجامەکە بنووسە.

٥ ١٢ ÷ ٣ = ▢  ٦ ٨ ÷ ▢ = ٤  ٧ ١٥ ÷ ٣ = ▢

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

کۆپی بکە پاشان تەواو بکە.

٨

| ÷ | ١٠ | ١٢ | ١٤ | ١٦ |
|---|---|---|---|---|
| ٢ | | | | |

٩

| ÷ | ٣٠ | ٣٥ | ٤٠ | ٤٥ |
|---|---|---|---|---|
| ٥ | | | | |

ژمارەی نادیار چییە؟

١٠ ٥ × ▢ = ٣٥  ٣٥ ÷ ٥ = ▢  ١١ ٥ × ▢ = ٤٥  ٤٥ ÷ ٥ = ▢

ڕاستییەکی لێکدان بنووسە کە دەتوانرێ بەکاربێت بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی دابەشکردن، لە پاشان ئەنجامەکە بنووسە.

١٢ ٢٧ ÷ ٣ = ▢  ١٣ ▢ = ٤ ÷ ٤

ئەنجامی دابەشکردن چەندە؟

١٤ ١٠ ÷ ٢ = ▢  ١٥ ١٢ ÷ ٤ = ▢  ١٦ ٣٠ ÷ ٥ = ▢  ١٧ ٤٥ ÷ ٩ = ▢

١٨ ٥⟌١٥  ١٩ ٣⟌٣  ٢٠ ٣⟌١٨  ٢١ ٥⟌٢٠

٢٢ **ڕێنوێنی** چی دەڵێیت بۆ ئەو ژمارانەی توانای دابەش بونیان هەیە بەسەر ٢؟
وەڵامی شیاو: کۆتاییان دێت بەم ڕەنووسانە ٠، ٢، ٤، ٦ یان ٨ ژمارەی جووتن.

٢٣ ڕێباز ٣٨ وێنەی پاڵەوانانی تۆپی پێی کڕی. ١١ وێنەیانی لە دیواری ژوورەکەی هەڵواسی، ئەوەی ماوە بەسەر ٣ برادەری بەشکرد. هەر برادەرێکی چەند وێنەی بەرکەوت؟

## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

٢٤ کام ڕاستی لێکدان یان دابەش بەکاردەهێنرێ بۆ دابەشکردنی ١٨ لەسەر ٦؟

أ ١٨ × ٦ = ١٠٨  ب ١٨ ÷ ٦ = ٣  ج ٦ ÷ ١٨ = ٣  د ٦ × ١٨ = ١٠٨



## پێداچوونەوەی خێرا

١ ٦ × ٣ = ▢

٢ ٦ × ٧ = ▢

٣ ٧ × ٤ = ▢

٤ ٧ × ٨ = ▢

وانەی ٥

# ڕاستییەکانی دابەشکردن تا ٩

### فێربە



**لە تورەگە** شانۆ ٢٤ کێکی دروست کرد بۆ فرۆشتن. لە چەند تورەگەیەکی دانا هەر یەکەیان ٦ کێك دەگرێت.
چەند تورەگەی پێویستە؟

٢٤ ÷ ٦ = ▢

بۆ شیکارکردنی ئەم پرسیارە، ڕاستی لێکدانی بەیەکبەستراوی بەکاربێنە.

بیربکەوە: ٦ × ▢ = ٢٤

٦ × ٤ = ٢٤ کەواتە ٢٤ ÷ ٦ = ٤ یان $6\overline{)24}$ (٤)

کەواتە، شانۆ ٤ توورەگەی پێویستە.

### نموونە

**أ** ٦٣ ÷ ٧ = ▢

بیربکەوە: ٧ × ▢ = ٦٣

٧ × ٩ = ٦٣

کەواتە ٦٣ ÷ ٧ = ٩ یان $7\overline{)63}$ (٩)

**ب** ٥٦ ÷ ٨ = ▢

بیربکەوە : ٨ × ▢ = ٥٦

٨ × ٧ = ٥٦

کەواتە ٥٦ ÷ ٨ = ٧ یان $8\overline{)56}$ (٧)

**سنجاق** سارا دوو جۆر سنجاقی لەسەر سنگی کۆکردەوە. ٤٥ سنجاقی گوڵ و ٥٦ سنجاقی ئاژەڵ. دەیەوێت هەموویان لە چەند پاکەتێك دابنێت. هەر یەکەیان ٩ سنجاق بگرێت. یارمەتی سارا بدە لە کارەکەیدا !

### نموونە

**ج** سنجاقی گوڵی لەو پاکەتانە دانا ٩ سنجاق دەگرن. چەند پاکەتی پێویستە؟

٤٥ ÷ ٩ = ▢

بیربکەوە: ٩ × ▢ = ٤٥

٩ × ٥ = ٤٥

کەواتە ٤٥ ÷ ٩ = ٥ یان $9\overline{)45}$ (٥)

کەواتە سارا ٥ پاکەتی پێویستە.

**د** سنجاقەکانی ئاژەڵان لەو پاکەتانە دانا کە ٨ سنجاق دەگرن. چەند پاکەتی پێویستە.

٥٦ ÷ ٨ = ▢

بیربکەوە: ٨ × ▢ = ٥٦

٨ × ٧ = ٥٦

کەواتە ٥٦ ÷ ٨ = ٧ یان $8\overline{)56}$ (٧)

کەواتە سارا ٧ پاکەتی پێویستە.

**بیرکردنی بە ڕەخنە** ئایا سارا دەتوانی سنجاقەکان بە ڕێگایەکی تر بەش بکا؟ ڕاڤەبکە.

**لەبیرمەکە** بۆ ئەوەی دابەشبکەی، بەدوای کۆڵکەی لێکدانی نادیار بگەڕێ لە ڕاستییەکانی لێکدانی بەستراوە بە پرسیارەکە.

- کام ڕاستی لێکدان بەکاردێت بۆ ئەنجامدانی ٤٢ ÷ ٧؟
ئەنجامی دابەشکردن چەندە؟

## ساغبکەوە

**١** ڕوونیبکەوە چۆن ڕاستی لێکدانی بەیەك بەستراو بەکاردێت بۆ ئەنجامدانی ١٨ ÷ ٦؟

**٢** ڕوونیبکەوە چۆن ڕاستی لیکدانی بە یەکبەستراو بەکاردێت بۆ ئەنجامدانی ٣٦ ÷ ٩؟
ئەنجامی دابەشکردن چەندە؟

کۆپی بکەو تەواو بکە.

**٣**

| ÷ | ٩ | ١٨ | ٢٧ | ٣٦ |
|---|---|---|---|---|
| ٩ | | | | |

**٤**

| ÷ | ٢٠ | ٣٠ | ٤٠ | ٥٠ |
|---|---|---|---|---|
| ١٠ | | | | |

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

کۆپی بکەو تەواو بکە.

**٥**

| ÷ | ٤٢ | ٦٣ | ٥٦ | ٤٩ |
|---|---|---|---|---|
| ٧ | | | | |

**٦**

| ÷ | ٥٦ | ٤٠ | ٤٨ | ٣٢ |
|---|---|---|---|---|
| ٨ | | | | |

ئەنجامی دابەشکردن چەندە؟

**٧** ٢⟌١٤

**٨** ٥⟌١٠

**٩** ٣⟌٣٠

**١٠** ٩⟌٩٠

**١١** ٨⟌٦٤

**١٢** ٨ دابەش بکە بەسەر ٨.

**١٣** ٧٢ دابەش بکە بەسەر ٨.

+ یان − یان × یان ÷ لە شوێنی ▢ دابنێ بۆ ئەوەی ڕستە ژمارەییەکە ڕاست دەرچێت.

**١٤** ٨ × ٣ = ٢٠ ▢ ٤

**١٥** ١٢ ▢ ٧ = ٥٠ ÷ ١٠

**١٦** **ڕێنوێنی:** کامیان گەورەترە ٢٤ ÷ ٦ یان ٢٤ ÷ ٤؟ چۆن دەزانیت؟

**١٧** دیلان ٤٨ کێکی بەسەر ٦ تورەگە بەشکرد بەیەکسانی چەند کێکی لە دوو تورگە دانا؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٨** ٤ هاوڕێ ٣٢ سێویان بەسەر یەکا بەیەکسانی دابەشکرد، هەریەکەیان چەند سێوی بەرکەوتووە؟

أ ٤ ب ٧ ج ٨ د ٢٨

وانەی ٦

# چەند ڕێگایەك لەسەر دابەشكردن

## فێربە

**ئۆتۆمبیلەكان لە پاكێت** ئالان ٣٦ ئۆتۆمبیلی بچووكی لە چەند پاكەتێك دانا، لەهەر یەكەیان ٩ ئۆتۆمبیل.
ئالان چەند پاكەتی پێویستە؟

٣٦ ÷ ٩ = ▢

لێرەدا زۆر ڕێگە هەیە بۆ هەژمێركردنی وەڵام.

أ بەكارهێنانی پەیكەكان.



كەواتە، ٣٦ ÷ ٩ = ٤

ب بەكارهێنانی ڕیزكراوەكان.



كەواتە، ٣٦ ÷ ٩ = ٤

ج بەكارهێنانی ڕاستییەكانی لێكدان و دابەشكردن.

**ڕاستییەكانی لێكدان و دابەشكردن بۆ ژمارەكانی ٤، ٩، ٣٦.**

٤ × ٩ = ٣٦ ٣٦ ÷ ٩ = ٤

٩ × ٤ = ٣٦ ٣٦ ÷ ٤ = ٩

كەواتە، ٣٦ ÷ ٩ = ٤

**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ٧ × ▢ = ٥٦

٢ ▢ × ٣ = ٢٧

٣ ٦ × ▢ = ٣٠

٤ ▢ × ٤ = ١٦



**د** بەدوای کۆڵکەی لێکدانی نادیار بگەڕێ.

**بیربکەوە:** ٩ × □ = ٣٦

- بڕوانە ستوونی ژمارە ٩.
- بەدوای ژمارە ٣٦ لەو ستوونەدا بگەڕێ.
- سەیری ئەو ژمارەیە بکە کەوتۆتە سەری ئەو ڕیزەی کە ژمارە ٣٦ تێدایە، ژمارە ٤ دەبینرێ.

کەواتە ٣٦ ÷ ٩ = ٤

| × | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ١ | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ |
| ٢ | ٠ | ٢ | ٤ | ٦ | ٨ | ١٠ | ١٢ | ١٤ | ١٦ | ١٨ | ٢٠ |
| ٣ | ٠ | ٣ | ٦ | ٩ | ١٢ | ١٥ | ١٨ | ٢١ | ٢٤ | ٢٧ | ٣٠ |
| ٤ | ٠ | ٤ | ٨ | ١٢ | ١٦ | ٢٠ | ٢٤ | ٢٨ | ٣٢ | ٣٦ | ٤٠ |
| ٥ | ٠ | ٥ | ١٠ | ١٥ | ٢٠ | ٢٥ | ٣٠ | ٣٥ | ٤٠ | ٤٥ | ٥٠ |
| ٦ | ٠ | ٦ | ١٢ | ١٨ | ٢٤ | ٣٠ | ٣٦ | ٤٢ | ٤٨ | ٥٤ | ٦٠ |
| ٧ | ٠ | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ | ٣٥ | ٤٢ | ٤٩ | ٥٦ | ٦٣ | ٧٠ |
| ٨ | ٠ | ٨ | ١٦ | ٢٤ | ٣٢ | ٤٠ | ٤٨ | ٥٦ | ٦٤ | ٧٢ | ٨٠ |
| ٩ | ٠ | ٩ | ١٨ | ٢٧ | ٣٦ | ٤٥ | ٥٤ | ٦٣ | ٧٢ | ٨١ | ٩٠ |
| ١٠ | ٠ | ١٠ | ٢٠ | ٣٠ | ٤٠ | ٥٠ | ٦٠ | ٧٠ | ٨٠ | ٩٠ | ١٠٠ |

**لەبیرمەکە** بۆ دۆزینەوەی ئەنجانی دابەشکردن دەتوانیت کۆمەڵە یەکسانەکان یان ڕیزکراوەکان یان لێدەرکردنی یەك بەدوای یەك یان ڕاستییەکانی بەیەکەوە بەستراو یان خشتەی لێکدان بەکاربێنی.

## ساغبکەوە

**١** **ڕوونیبکەوە:** چۆن ٥٦ ÷ ٨ ئەنجام دەدەیت بەدوو ڕێگەی جیاواز؟

ڕستەی دابەشکردن بنووسە بۆ هەریەك لەمانەی خوارەوە.

**٢**



**٣**



ژمارەی نادیار چەندە؟

**٤** ٣ × □ = ١٥ ‏ ‏ ١٥ ÷ ٣ = □

**٥** ٤ × □ = ٤٠ ‏ ‏ ٤٠ ÷ ٤ = □

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

ڕستەی دابەشکردن بنووسە بۆ هەریەك لەوانەی دێن:

**٦**



**٧**



ژمارەی نادیار چەندە؟

**٧** ١٠ × ■ = ٩٠     ٩٠ ÷ ١٠ = ■

**٨** ٤ × ■ = ١٦     ١٦ ÷ ٤ = ■

ڕستەیەکی دابەشکردنی گونجاو بۆ هەر وێنەیەك هەڵبژێرە.

**٩**



**١٠**



٤٢ ÷ ٦ = ٧
٣٦ ÷ ٩ = ٤
٥٦ ÷ ٧ = ٨
٢٧ ÷ ٩ = ٣

## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١١** ئەنجامی دابەشکردنی ٢٨ ÷ ٧ = ؟

أ ١    ب ٤    ج ٦    د ٧

## شیکارکردنی پرسیارەکان



## یاری ژمارەکان

**کەرەستەکان:** کارتی ڕەنووسکراو لە ٠ تا ٩.

**ژمارەی یاریزان:** ٢.

یاریزانانی یەکەم ٤ کارت هەڵدەبژێری و بەکاریان دەهێنێ بۆ نووسینی ژمارەی ٤ ڕەنووس، هەر ڕەنووسێك دووجار بەکاردێت.

یاریزانی دووەم بەهەمان کار هەڵدەستێ.

هەر یاریزانێك دوو ژمارەکەی کۆ دەکاتەوە. ئەوەی گەورەترین سەرجەمی دەست دەکەوێ براوەیە.

دەکرێت یاریەکە دووبارە بکرێتەوە تا بچووکترین سەرجەم براوە بێ.

أ لە یاری گەورەترین سەرجەم، ئەگەر ڕەنووس ٩ دەستکەوت لە کام خانەی دادەنێت؟

ب لە یاری بچووکترین سەرجەم، گەورەترین ڕەنووس لەکام خانەدا دادەنێی؟











وانەی
٧

# ڕێگاكانی شیكاری پرسیارەكان

## بەهەنگاوەكانتا بگەڕێوە



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ١٨ ÷ ٣ =
٢ ١٢ ÷ ٤ =
٣ ٢٤ ÷ ٦ =
٤ ٢٠ ÷ ٢ =

**پرسیار** دایكی شوان نانی دەكرد هەمان ژمارە كولێرەی لە ٣ سینی دانا، پوری ٤ كولێرە زیاتری كرد لە دایكی. ئەگەر پوری ٣١ كولێرەی كردبێت. دایكی شوان لەهەر سینیەك چەند كولێرەی دانا؟



### تێبگە

- داوا كراو چییە؟
- ئەو پێدراوانەی كە بەكارت هێناوە چین؟
- ئایا پێدراوی تر هەیە بەكارت نەهێنابێ؟ چییە؟

### پلاندانان

- كام ڕێگە بەكاردێنی بۆ شیكاركردنی پرسیارەكە؟

دەتوانی ڕێگەی «بەهەنگاوەكانتا بگەڕێوە» بەكاربێنی بۆ ئەوەی ژمارەی كۆلێرەكانی هەر سینیەك بدۆزیەوە.

### شیكاربكە

- چۆن ئەو ڕێگەیە لە شیكاركردن بەكاردێنی؟

دەست بكە بە ژماردنی كۆلێرەكانی پوری شوان، ژمارەی كۆلێرە زیادەكانی لێ دەربكە.

| ٣١ | − | ٤ | = | ٢٧ |
|---|---|---|---|---|
| ↑ | | ↑ | | ↑ |
| ژمارەی كۆلێرەكانی پوری | | ژمارەی كۆلێرە زیادەكان | | ژمارەی كۆلێرەكانی دایكی شوان |

كەواتە، دایكی شوان ٢٧ كۆلێرەی هەبوو، لە ٣ سینی دانا.

ژمارەی كۆلێرەكانی دایكی شوان بەشبكە بەسەر ژمارەی سینیەكان.

| ٢٧ | ÷ | ٣ | = | ٩ |
|---|---|---|---|---|
| ↑ | | ↑ | | ↑ |
| ژمارەی كۆلێرەكانی دایكی شوان | | ژمارەی سینیەكان | | ژمارەی كۆلێرەكان لەهەر سینیەك |

كەواتە، ژمارەی كۆلێرەكان لەهەر سینیەك بریتییە لە ٩ كۆلێرە.

### ساغبكەوە

- بە پرسیارەكە بچۆرەوە. ئایا وەڵامەكەت گونجاوە؟

## ڕاهێنـان و شیکارکـردنـی پرسیـارەکـان

ڕێگەی «بەهەنگاوەکانتا بگەڕێوە» بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی پرسیارەکە.

1. ئەگەر دایکی شوان ٤ سینی جیاوازی بەکارهێنا، لە ٣ سینی هەمان ژمارە کۆلێرەی دانا وە لە سینی چوارەم ٣ کۆلێرەی دانا، چەند کولێرە لە هەریەك لە ٣ سینیەکەی یەکەم دادەنێت. ئەگەر ژمارەی کولێرەکان هەموویان ٢٧ بن؟

**توانا دوو کتێبی کڕی هەمان بەهایان هەیە. ٢٠ هەزار دیناری دایە فرۆشیارەکە ٦ هەزاری بۆ گەڕاندەوە. بەهای هەر کتێبێك چەندە؟**

2. کام ڕستەی ژمارەیی ڕێگە دەدات بۆ هەژمارکردنی بەهای گشتی هەردوو کتێبەکە؟

أ ٢٠ + ٦ = ٢٦ ج ٢ × ٦ = ١٢
ب ٢٠ − ٦ = ١٤ د ٢٠ ÷ ٢ = ١٠

3. بەهای هەر کتێبێك چەندە؟

أ ٦ هەزار ج ٧ هەزار
ب ١٠ هەزار د ١٤ هەزار

## ڕێگەکانی شیکارکردنی پرسیار

- هێلکاریەك یا وێنەیەك بکێشە
- شێوازێك دروستبکە یان بەکردار جێبە جێبکە
- لیستێکی ڕێك دروست بکە
- بەدوای شێوازێك بگەڕێ
- خشتەیەك یان وێنەیکی ڕوونکردنەوەیی دروستبکە.
- بخەملێنە وساغبکەوە
- **بە هەنگاوەکاندا بگەڕێوە**
- پرسیاری ئاسانتر شیکاربکە
- ڕستەیەکی ژمارەیی بنووسە.
- دەرئەنجام ژیربێژی بەکاربێنە

## ڕاهێنان لەسەر ڕێگا جیاوازەکان

پێدراوەکان بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانەکانی ٤ تا ٥.

4. باوکی کارزان ڤیدیۆیەك و کاتژمێرێکی کڕی و ٩٨٥ هەزار دیناری دا بە فرۆشیارەکە ١٣ پارچە پارەیان بۆ گەڕاندەوە لە چەشنی ٢٥ هەزاری و ١٠ هەزاری. چەند پارچەیان لە هەر چەشنێك بۆ گەڕاندەوە؟

5. **هەڵە لەکوێیە؟** نەشوان وتی بەهای تەلەفزیۆنێك و دوو ڕادیۆ دەکاتە ١١٦٥ هەزار دیناری، ڕوونیبکەوە هەڵەی نەشوان لە کوێیە، بەهای ڕاست بنووسە.

| لیستی بەهاکان | |
|---|---|
| کاتژمێر | ٧٥ هەزار |
| ڕادیۆ | ٣٤٥ هەزار |
| ڤیدیۆ | ٦٧٥ هەزار |
| تەلەفزیۆن | ٨٢٠ هەزار |

## بەشی ٦

# پێداچوونەوە

### دڵنیابوون لە هەبوونی زاراوەکان و چەمکەکان

دەربڕینی گونجاو لە لیستی بەرامبەر هەڵبژێرە.

| |
|---|
| دابەشدەکەین |
| بەشدراو |
| ئەنجامی دابەشکردن |
| دووکرداری پێچەوانەن |

**١** لێکدان و دابەشکردن ___؟___ .

**٢** ئەگەر ١٨ ÷ ٦ = ٣ ئەوا ژمارە ٣ دەکاتە ___؟___ .

**٣** کاتێ شتەکان بەش دەکەن بۆ کۆمەڵە یەکسانەکان ئەوا ئێمە ___؟___ .

ڕستەی دابەشکردن بۆ هەر یەکە لەمانە بنووسە.

**٤** **٥**



### دڵنیابوون لە کارامەییەکان

ڕستەی ژمارەیی تەواوبکە. ڕیزکراوەیەك بکێشە بۆ یارمەتیدان.

**٦** ٢ × ▢ = ٦ ، ٦ ÷ ٢ = ▢

**٧** ٤ × ▢ = ٤ ، ٤ ÷ ٤ = ▢

ڕاستییە بەیەکبەستراوەکانی لێکدان و دابەشکردن کە پەیوەستە بەو ژمارانە بنووسە.

**٨** ٤ ، ٥ ، ٢٠

**٩** ٢ ، ٧ ، ١٤

ژمارەی نادیار چییە؟

**١٠** ٨ × ▢ = ٤٠ ، ٤٠ ÷ ٨ = ▢

**١١** ٧ × ▢ = ٥٦ ، ٥٦ ÷ ٧ = ▢

دابەش بکە.

**١٢** ١٦ ÷ ٤ = ▢

**١٣** ▢ = ٢١ ÷ ٣

**١٤** ١٤ ÷ ٧ = ▢

**١٥** ▢ = ٣٠ ÷ ٦

**١٦** ٤⟌٣٢

**١٧** ١⟌١٠

**١٨** ٢⟌١٤

**١٩** ١٠⟌٩٠

لیستی بەهاکان بەکاربێنە، بەهای هەریەك لەمانەی دێت دیاربکە.

| لیستی بەهاکان | |
|---|---|
| تۆپ | ٣ هەزار دینار |
| کراس | ٩ هەزار دینار |

**٢٠** ٤ تۆپ

**٢١** ٧ کراس

**٢٢** ٣ کراس

بەهای هەر دانەیەك «نرخی تاکێك» چەندە؟

**٢٣** ٥ تێنووس بەهایان ١٠ هەزار دینارە.

**٢٤** ٦ ڕاستە بەهایان ١٨ هەزار دینارە.

### دڵنیابوون لە شیکارکردنی پرسیارەکان

ڕستەیەکی ژمارەیی بنووسە بۆ شیکارکردنی پرسیارەکە.

**٢٥** شانۆ ٢٤ کارتی لە ڕیزکراوەیەکی ٦ ڕیزی بەشکرد. ژمارەی کارتەکانی یەك ڕیز چەندە؟

**٢٦** دیاری ٥ پاکەت خورمای هەبوو هەر پاکەتێك ٨ دەنکی تێدایە. ژمارەی دەنکە خورماکان چەندە؟

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**ئاگاداربە!**

- هەموو ناوەڕۆکەکە بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت لە پرسیار.
- وەڵامەکانت ساغبکەوە.

**وەڵامی گونجاو دەور بدە لە ڕاهێنانەکانی ١ تا ١٠.**

**١** تارا دەیەوێت ٤٠ سێو بەش بکات بەسەر ٨ قاپ بەیەکسانی. چەند سێو لەهەر قاپێك دادەنێت؟

أ ٣    ب ٤    ج ٥    د ٦

**٢** ڕەنجدەر ٤ ئۆتۆمبیلی بچووکی کڕی بەهای هەر یەکەیان ٦ هەزار دینار بوو چەند هەزاری داوە؟

أ ١٨    ب ٢٠    ج ٢٤    د هیچ لەمانە

**٣** کام ڕستەی ژمارەیی ڕاستیەکانی لێکدان و دابەشکردن کە پەیوەست بەو ژمارانە ٧، ٦، ٤٢ نییە؟

أ ٧ × ٦ = ٤٢    ب ٤٢ − ٦ = ٣٦    ج ٦ × ٧ = ٤٢    د ٤٢ ÷ ٦ = ٧

**٤** دۆستی ٢٤ وانەی وێنەکێشانی بۆ ماوەی ٨ هەفتە خوێند. کام ڕستە ژمارەی وانەکان دەدات کە لە هەفتەیەکدا خوێندویەتی؟

أ ٢٤ + ٨ = ٣٢    ب ٢٤ − ٨ = ١٦    ج ٦ × ٤ = ٢٤    د ٢٤ ÷ ٨ = ٣

**٥** مامۆستا ٤٥ پێنووسی لە ٥ پاکەت دانا. چەند پێنووسی لەهەر پاکەتێك دانا؟

أ ٦    ب ٧    ج ٨    د ٩

**٦** ٥٠٩ + ٤٩٣ = ▢

أ ١٠٠٢    ب ٩٩٦    ج ٩٠٢    د ١٩٦

**٧** سەرکردەی تیپی دێدەوان ٦٤ قوتابی بەسەر ٨ کۆمەڵەی یەکسان بەشکرد. چەند قوتابی لەهەر کۆمەڵەیەك دانا؟

أ ٤    ب ٦    ج ٨    د ٩

**٨** ٤٢ ÷ ٧ = ▢

أ ٩    ب ٨    ج ٧    د هیچ لەمانە

**٩** ڕووناك ٤٧ گوڵی کڕی ١٧ گوڵی دا بە براکەی، ئەوەی مایەوە بەسەر هەر ٦ خوشکەکەی دابەشکرد. هەریەکەیان چەندیان بەرکەوتووە؟

أ ٥    ب ٨    ج ٣٠    د ٧٠

**١٠** شەمەندەفەری ترس لەشاری یاری لەهەر ٢٠ خولەکێك دەردەچێت، لە کاتژمێر ٨:٠٠ دەست پێدەکا. دەوەن کاتژمێر ٩:١٠ گەیشت. لە چ کاتێك شەمەندەفەری داهاتوو دەردەچێ؟

أ ٩:٢٠    ب ٩:٣٠    ج ٩:٣٥    د ٩:٤٥

## ئەوەی دەیزانی بینووسە

**١١** باوکی هێرۆ ٢٧ پوولی بۆ کڕی. لە ئەلبومێکی دانا لەهەر لاپەڕەیەك ٩ پوول. چەند لاپەڕەی پێویستە؟ ڕستەی ژمارەیی بنووسە بۆ شیکارکردنی پرسیارەکە. ژمارەی لاپەڕەکان چەندە؟

بەشی ٧

# ئەندازە و پێوان



زۆربەی شێوە ئەندازەییەکان سیفەتی هاوجێیوونیان تێدایە. هەروەها هاوجێبوون لە زۆربەی گیاندارەکان و ڕووەکەکان دەبینین، هەندێ شێوە لە یەک هێڵی هاوجێبوونیان زیاتر هەیە.

## پرسیار بۆ شیکارکردن:

سەیری ئەم سەدەفە بکە ئایا ئەو هێڵەی لەسەر وێنەکە کێشراوە هێڵی هاوجێبوونە؟ چۆن ئەوە دەزانی؟

# زانيارييەكانت ساغبكەوە



ئەم لاپەڕەيە بەكاربهێنە بۆ دڵنيابوون لە هەبوونى
ئەم زانيارييانەى كەوا پێويستە لەم بەشەدا

## تەنە ئەندازەييەكان

دەربڕينى گونجاو هەڵبژێرە لە ليستى بەرامبەر.

| |
|---|
| شەش پالو |
| قوچەك |
| لوولەك |
| هەرەم |
| ڕوولاكێشە تەريب |
| گۆ |
| بازنە |
| لاكێشە |
| چوارگۆشە |
| سێگۆشە |

١  ٢  ٣ 

٤  ٥  ٦ 

## شێوە ئەندازەييەكان

دەربڕينێكى گونجاو هەڵبژێرە لە ليستى بەرامبەر.

٧  ٨ 

٩  ١٠ 

## لاكان و سەرەكان

ژمارەى لاكان و سەرەكان لەهەر شێوەيەك چەندن؟

١١  ١٢  ١٣ 

١٤  ١٥  ١٦ 

## ڕاستەى سانتيمەترى بەكاربێنە

وێنەى بەرامبەر بەكاربێنە بۆ شيكاركردنى ڕاهێنانى ١٧ تا ١٩.







١٧ كام دەزوو درێژييەكەى ٣ سانتيمەترە؟

١٨ كام دەزوو درێژييەكەى ١ سانتيمەترە؟

١٩ كام دەزوو درێژييەكەى نزيكەى ١ سم زياترە لە درێژى دەزووى ب؟

وانەی ١

# تەنە ئەندازەییەکان

## پێداچوونەوەی خێرا

ناوی هەر یەك لە شێوە ئەندازەییەکان بڵێ.

١ ○   ٢ ▭   ٣ ◺   ٤ □

## زاراوەکان

ڕوو   لا   سەر

### فێربە

**تەنە ئەندازەییەکان بناسە** تەنە ئەندازەییەکان بەکاربێنە بۆ ناسینی ئەو شتانەی لە دەوروبەرتن.



لا

ڕوو

سەر

| |
|---|
| ڕووبەرە تەختەکەی سەر تەنی ئەندازەیی **«ڕووە»** بۆ تەنە ئەندازەییەکان. |
| پارچە ڕاستە هێڵە هاوبەشەکەی نێوان دوو لە ڕووەکانی تەنە ئەندازەیی **«لایەکە»** لە لاکانی تەنی ئەندازەیی. |
| خاڵی بەیەك گەیشتنی ٣ لا یان پتر لە لاکانی تەنی ئەندازەیی **«سەرە»** یەکە لە سەرەکانی تەنی ئەندازەیی. |

ڕوو لاکیشە تەریب ٦ ڕوو ١٢ لا و ٨ سەری هەیە.

- ژمارەی لاکانی شەش پاڵوو چەندە؟ ژمارەی لاکانی بازنە چەندە؟
- **دەرئەنجام** ئەو تەنە ئەندازەییانەی کەوا گلۆر دەبنەوە چین؟ ڕوونی بکەوە؟

## وێنەکێشانی ڕووە تەنە ئەندازەییەکان

ناوی شێوە ئەندازەییەکان بەکاربێنە بۆ ناسینەوەی ڕووی تەنەکان.



بەدەستی

### چالاکی

**کەرەستەکان:** تەنە ئەندازەییەکان (هەرەم، ڕوولاکێشە تەریب، شەشپاڵوو، کاغەز، پێنووس) وێنەی ڕووەکانی ژمارەیەك لە تەنە ئەندازەییەکان بکێشە، پاشان ناوی هەریەك ،لە ڕووە کێشراوەکان بڵێ

**هەنگاوی ١**

لەسەر کاغەزێك هێڵکارییەك وەك هێڵکاری خوارەوە بکێشە. پاشان ڕووەکانی ئەو تەنە ئەندازەییەی لە وێنەکەدا دیارە بکێشە.

| ناوی تەنی ئەندازەیی | ڕووەکان | ناوی ڕووەکان و ژمارەیان |
|---|---|---|
| هەرەم | □ △ △ △ △ | |

**هەنگاوی ٢**

خشتەکە تەواو بکە. بەتۆمارکردنی ناو و ژمارەی ڕووەانی تەنەکە.

| ناوی تەنی ئەندازەیی | ڕووەکان | ناوی ڕووەکان و ژمارەیان |
|---|---|---|
| هەرەمی چوارینە ▯ | □ △ △ △ △ | چوارگۆشەیەك ٤ سێگۆشە |

**لەبیرمەکە** هەندێ لە تەنە ئەندازەییەکان (ڕوو)و (لا) و (سەر) یان هەیە ڕووەکانی تەنە ئەندازەییەکان شێوە ئەندازەیی تەختن وەك چوار گۆشەو لاکێشە وسێگۆشە.

## ساغبكەوە

**١** ڕوونیبكەوە چۆن دەزانی كە گۆ هیچ ڕووی نییە؟

ناوی ئەو تەنە ئەندازەییانە بڵێ كە لەم شتانە دەچن؟

**٢**



**٣**



**٤**



**٥**




ئەو خشتەیە تەواو بكە.

| | تەنی ئەندازەیی | ژمارەی ڕووەكان | ژمارەی لاكان | ژمارەی سەرەكان |
|---|---|---|---|---|
| **٦** | ڕوولاكێشە تەریب | ▦ | ▦ | ▦ |
| **٧** | گۆ | ▦ | ▦ | ▦ |
| **٨** | شەشپاڵوو | ▦ | ▦ | ▦ |
| **٩** | هەرەم | ▦ | ▦ | ▦ |

**١٠** لە لای هاوڕێ كارتۆنێكی ڕوو لاكێشە تەریب هەیە هەر ڕوویەك لە ڕووكانی بەڕەنگێك ڕەنگ كرد. ئایا چەند ڕەنگی بەكارهێناوە؟

**١١** ڕوولاكێشە تەریب و شەشپاڵوو بە چی لەیەك دەچن وە بەچێ لەیەك جیاوان؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٢** كام تەنە ئەندازەیی ٤ ڕووی هەیە؟

أ شەشپاڵوو  ب قوچەك  ج لوولەك  د هەرەمی سێینە

## شیكاركردنی پرسیارەكان



## گۆشەی ڕووناكبیران

**بیركردنەوەی بە دیتن** دەتوانی ئەوەی دەیزانی لە ڕووەكانی تەنە ئەندازەیی بەكاربێنی بۆ دروستكردنی نموونەیەك.

**كەرستەكان:** كاغەز، پێنووس، مەقەس، شریتی پێوەنوساندن.



- شێوەی بەرامبەر لەسەر كاغەز بكێشە، وە دڵنیابە لە كێشانی هێڵە خالدارەكان.
- كاغەزەكە ببڕە بە گوێرەی هێڵە گەیەنراوەكان.
- دەست بكە بە نوشتاندنەوەی كاغەزەكە بە گوێرەی هێڵە خالدارەكان تا چوار سەرەكە بەیەك دەگەن.
- سنوورەكانی شێوەكە ببەستەوە.

ناوی ئەو تەنە ئەندازەییە چییە كە دەستكەوت؟ ناوی ڕووەكانی چییە؟

وانەی
٢

# پێکهێنانی تەنە ئەندازەییەکان



## پێداچوونەوەی خێرا

ناوی هەریەکە لە تەنە ئەندازەییەکان بڵێ



١ ٢ ٣ ٤

## فێربە



**کۆیان بکەوە** هەندێ لە شتەکان لە چەند تەنێکی ئەندازەیی پێکهاتوون. سەیری خانووی بەرامبەر بکە.

ئەو تەنە ئەندازەییانە چین کە ئەم خانووەیان لێ پێك هاتووە؟

سەیری هەر پارچەیەك لە پارچەکانی ئەم خانووە بکە بە تەنیا، و ناوی ئەو تەنە ئەندازەییانە بڵێ کە دەیانناسی.



شەشپاڵوو



هەرەم



ڕووڵاکێشە تەریب

بڕوانە خانووەکە لە شەشپاڵوو و هەرەم و ڕووڵاکێشەتەریب پێکهاتووە.

**لەبیرمەکە** دەتوانی بە پێکهێنانی تەنە ئەندازەییەکان تەنی جیاوازت دەست کەوێت.



### نموونە



أ ب ج

- ئەو تەنە ئەندازەییانە چین کە تەنی (أ) پێکدەهێنی؟
- ئەو تەنە ئەندازەییانە چین کە تەنی (ب) پێکدەهێنی؟

## ساغبکەوە

١ **ڕوونیبکەوە** چۆن دەتوانی تەنی (ب) وا لێبکەی بە تەنی (ج) بچێت؟

ئەو تەنە ئەندازەییانەن چین کە هەریەك لەم تەنانە پێکدەهێنن؟

٢



٣



٤



## راهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

ئەو تەنە ئەندازەییانە چین کە هەریەك لەم تەنانە پێکدەهێنن.

**٥** 

**٦** 

**٧** 

ناوی ئەو تەنە ئەندازەییە پڵێ کە پێویستە زیادی بکەین بۆ شتی دووەم بۆ ئەوەی وەکو یەکەمی لێبێت؟

**٨** 

**٩** 

**١٠** 

**١١** 

**١٢** 

**١٣** 

**١٤** کام دوو تەنە ئەندازەیی ناسراوت دەست دەکەوێت ئەگەر شەشپاڵوویەك بکەیت بە دوو نیوە؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٥** تەنە ئەندازەیی بەرامبەر:



أ لوولەك

ب لوولەك وگۆ

ج لوولەك دوو نیوە گۆ

د گۆ و لاکێشەتەریب

## شیکارکردنی پرسیارەکان



## دەروازەیەك لەسەر خوێندنەوە

### چۆن پێدراوە پێویستەکان هەڵدەبژێریت

هەندێ پرسیار پێدراوی پتر لە پێویست لە خۆدگرێ.
پێش دەست بکەی بە شیکارکردنی پرسیار، پێدراوە پێویستەکان دیاری بکە. رۆژی چەژن، دانا ٨ گوڵدانی پڕکرد لە گوڵ وە دوو دەسکە خونچە. دانا ٤٨ گوڵی بەیەکسانی بەشکرد. چەند گوڵی لەهەر گوڵدانێك دانا؟

**پێدراوە پێویستەکان:** دانا ٨ گوڵدانی بە ٤٨ گوڵ پرکرد.

**ئەو پێدراوانەی پێویست نین:** دوو دەسکە خونچەکە.

**شیکارکردن:** ٤٨ ÷ ٨ = ٦

لەهەر گوڵدانێك ٦ گوڵ هەیە.



پێدراوە پێویستەکان بنووسە. شیکارکردنی پرسیار.
شارا ٤ تەبەق شیرینی و ٣ کێکی لە بەیانی ئامادەکرد.
وە پاش نیوەڕۆ ٣ تەبەقی ئامادەکرد. ژمارەی پارچە شیرینییەکان بووە ٦٣.
چەند پارچە شیرینی لەهەر تەبەقێك هەیە؟

وانەی ٣

بەدەستی

# جووتبوونی شێوەکان و هاوجێبوونیان

فێربە



## پێداچوونەوەی خێرا

ژمارەی لاکان و ژمارەی سەرەکانی هەر شێوەیەك بنووسە.




## زاراوەکان

شێوە جووتەکان، هێڵی هاوجێبوون

## کەرستەکان

قوتووی پارچە ئەندازەیی، کاغەزی خاڵکراوی سێگۆشەیی، پێنووس.



**ئەو شتە خۆیەتی** ئەو شتەی خوارەوە دوو لاکێشە پیشاندەدات.



کاغەزێکی ڕوون بخەرە سەر لاکێشە لارەکە، وێنەی لاکێشەکە بکە لەسەر کاغەزە ڕوونەکە، پاشان کاغەزە ڕوونەکە بگوازەوە بۆ سەر لاکێشەکەی تر، کاغەزە ڕوونەکە بجوولێنەوە تاوەکو وێنەکە جووت دەبێت لەگەڵ لاکێشەکە لەسەر لاپەڕەی کتێبەکە. دەبینیت کە وێنەکە جووت دەبێت لەسەر لاکێشەکە.

لەوەوە دەردەبڕێت و دەڵێیت کە دوو لاکێشەکە **جووتن.**

ئەوە دووبارە بکە لەگەڵ ئەو دوو شێوەیەی بەرامبەر دەبینیت کە جووت نابن.



شێوە جووتەکان هەمان ڕوخسار و پێوانەیان هەیە، لەوانەیە شێوەکان دانانیان جیاوازبێت بەڵام بەردەوام جووتن.

**نموونە** سەیری دوو شێوەکە بکەو باسبکە ئایا جووتن.

| ج | ب | أ |
| --- | --- | --- |
|  |  |  |
| جووت نین هەمان پێوانەیان نییە | جووتن چونکە هەمان ڕوخسار و پێوانەیان هەیە | جووت نین هەمان ڕوخساریان نییە |

## باسبکە

- چۆن دەزانیت کە دوو شێوە جووتن یان نا.
- ئایا ئەو دوو بازنەیەی بەرامبەر جووتن.



## دوو نیوە

ڕاستە هێڵەکە سێگۆشەی بەرامبەر بەشدەکات بۆ دووبەش. کاغەزی ڕوون بەکاربهێنە و ساغبکەوە کە دوو بەشەکە جووتن.

بەم ڕاستە هێڵە دەوترێت **هێڵی هاوجێبوون** بۆ سێگۆشە.

چوارگۆشەیەك وێنە بکێشە، ڕاستەهێڵێك بکێشە بەدوو سەری بەرامبەردا بڕوات، کاغەزەکە بچەمێنەوە لە ئاستی ڕاستەهێڵەکەوە، ئایا دوو بەشەکە جووت دەبن.

دوو بەشەکە جووت دەبن، کەواتە ڕاستەهێڵەکە هێڵی هاوجێبوونە بۆ چوارگۆشەکە.

**بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە:** ئایا چوارگۆشە هێڵی هاوجێبوونی کەی هەیە؟ ئەگەر وەڵامەکەت بەڵێیە، وێنەی هەموویان بکێشە.

## ساغبکەوە

**کاغەزی ڕوون بەکاربهێنە بۆ ساغکردنەوەی ئەوەی دوو شێوەکە جووتن یان جووت نین.**



**وێنەکە کۆپی بکە بەبەکارهێنانی کاغەزی ڕوون. چەمانەوە بەکاربهێنە لە ئاستی هێڵی خاڵکراوەکە بۆ ساغکردنەوەی ئەوەی ئایا ڕاستەهێڵەکە هێڵی هاوجێبوونە یان نا.**



٦ **ڕێنوێنی** جەمیل گوتی هەموو چوارگۆشەکان جووتن ئایا لەگەڵ ڕای ئەوی یان نا؟ باسیبکە.

٧ ئایا پێویستە دوو شێوە یەك باریان هەبێت بۆ ئەوەی جووت بن؟ هۆکاری وەڵامەکە باسبکە.

## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

٨ کام شێوە جووتە لەگەڵ شێوەی بەرامبەر.


أ


ب


ج


د



وانەی ٤

# ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان

## پرسیارێکی ئاسانتر شیکاردەکەم



### پێداچوونەوەی خێرا

ژمارەی ڕووەکانی هەر یەك لە تەنە ئەندازەییەکان بنووسە.




**پرسیار** ڕووەکانی شەشپاڵووی بەرامبەر لە چوارگۆشەی بچووك پێکدێت ژمارەی چوارگۆشە **بچووکەکانی** سەر هەموو ڕووەکانی شەشپاڵووەکە چەندە؟



### تێبگە

- داواکراو چییە؟
- ئەو پێدراوانە چین کە لە پاشان بەکاریان دێنیت؟
- ئایا پێدراوی تر هەیە بەکارت نەهێنابێ؟ چییە؟

### پلاندابنێ

- ئەم ڕێگەیە چییە بەکاری دەهێنی بۆ شیکارکردنی پرسیارەکە؟

دەتوانی ڕێگەی (شیکاری پرسیارێکی ئاسانتر) بەکاربێنی

### شیکاربکە

- چۆن ئەم ڕێگایە بەکاردەهێنی بۆ شیکارکردنی پرسیار؟



دەستدەکەم بە ژماردنی ئەو چوارگۆشانەی کە لەیەك ڕووی لە ڕووەکانی شەشپاڵووەکەن. ٣ ڕیز هەیە لە چوار گۆشەکە، لەهەر ڕیزێك ٣ چوارگۆشەی بچووك هەیە.

$$٣ \times ٣ = ٩$$



- ژمارەی چوارگۆشە بچووکەکان لەهەر ڕوویەك دەکاتە٩.

شەشپاڵو ٦ ڕووی هەیە.

ژمارەی ڕووەکان جارانی ژمارەی چوارگۆشەکان لەهەر ڕوویەك بکە.

$$٦ \times ٩ = ٥٤$$

کەواتە، ژمارەی هەموو چوارگۆشە بچووکەکان بریتییە لە ٥٤ چوارگۆشە.

### ساغبکەوە

- چۆن دەزانی وەلامەکەت ڕاستە؟

## ڕاهێنــان و شیکارکــردنی پرسیــارەکان

ڕێگای «پرسیارێکی ئاسانتر شیکاربکە» بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی پرسیارەکان.

**١** لەسەر هەر ڕوویەکی شەشپاڵووەکە ٤ چوارگۆشەی بچووك هەبێت، چەند چوارگۆشەی بچووك لەسەر ئەو شەشپاڵووە هەیە؟



**٢** هەروەها چەند لاکێشەیەك هەیە لەسەر ڕووەکانی شەشپاڵووی ناوبراو کە هەروەك ئەو لاکێشەیەی لە خوارەوە کێشراوە. ژمارەی لاکێشەکانی سەرهەموو ڕووەکانی شەشپاڵووەکە چەندن؟



**لە مۆزەخانەی لوڤەر لە شاری پاریسی فەرەنسی هەرەمێکی شووشەیی هەیە، چەند سێگۆشەیەك لەسەر ڕووەکانی ئەم هەرەمە هەیە.**



**٣** ژمارەی سێگۆشەکان لەسەر یەك ڕوو لە ڕووەکانی هەرەم چەندە؟
ئاگاداربە: سێگۆشەی وا هەیە کە لە پێوانەدا جیاوازن.

أ یەك سێگۆشە
ب ٤ سێگۆشە
ج ٥ سێگۆشە
د ١٠ سێگۆشە

**٤** کام ڕستەی ژمارەیی ژمارەی سێگۆشەکان لەهەر چوار ڕووەکانی هەرەم دیاردەکات؟

أ ١٠ × ٥ = ٥٠
ب ١٠ + ١٠ + ١٠ + ١٠ = ٤٠
ج ٤ × ٤ = ١٦
د ١ + ١ + ١ + ١ = ٤

### ڕاهێنان لەسەر ڕێگاکانی هەمە جۆر

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** ستوونەکانی ڕوونکردنەوە بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانی ٥ تا ٧.




**٥** قوتابیانی پۆلی پێنجەم لەسەر ٥ تەختە دانیشتن دوو قوتابی مانەوە.
ئایا ژمارەی قوتابیانی دانشتوی سەر یەك تەختە چەندن؟

**٦** دەرئەنجام قوتابیانی پۆلی سێیەم هەموویان دەتوانن بەیەکسانی و بە دوو ڕێگە لەسەر تەختەکان دابنیشن. ژمارەی تەختەکان لەهەر ڕێگەیەکدا چەندە؟

**٧** ژمارەی قوتابیان لەهەر چوار پۆلەکەدا چەندە؟
ڕستەیەکی ژماریی بنووسە بۆ شیکارکردنی.

### ڕێگەکانی شیکارکردنی پرسیار

- هێلکاریەك یا وێنەیەك بکێشە
- شێوازێك دروستبکە یان بەکردار
- جێیە جێبکە لیستێکی ڕێك
- دروست بکە بەدوای شێوازێك
- بگەڕێ خشتەیەك یان وێنەیکی ڕوونکردنەوەیی دروستبکە.
- بخەملێنە وساغبکەوە بە
- هەنگاوەکاندا بگەڕێوە
- **پرسیاری ئاسانتر شیکاربکە**
- ڕستەیەکی ژمارەیی بنووسە.
- دەرئەنجام ژیربێژی بەکاربێنە

وانەی ٥

# درێژی

## پێداچوونەوەی خێرا

١ ٧ × ▢ = ٤٢

٢ ▢ × ٥ = ٤٥

٣ ▢ × ٨ = ٣٢

٤ ٩ × ▢ = ٦٣

## زاراوەکان

سانتیمەتر (سم)

مەتر (م)

کیلۆمەتر (کم)

## فێربە

**درێژی چییە؟** بۆ پێوانی درێژییەکان و دوورییەکان. ئەو یەکە پێوانانە بەکاردێنن **سانتیمەتر (سم)**، **مەتر (م)**، **کیلۆمەتر(کم)**.

سانتیمەتر نزیکە بە پانی پەنجەکەت



مەتر نزیکەی بە درێژی هەردوو دەستت بەکراوەیی



کیلۆمەتر یەکەیەکی درێژییە بۆ پێوانی دوورییەکان



## چالاکی

کەرەستەکان: ڕاستەی سانتیمەتری.

**هەنگاوی ١**

خشتەکە کۆپیبکە

| درێژییەکان بە سانتیمەتر | | |
|---|---|---|
| شتەکان | درێژی بە نزیکی | پێوانی درێژی |
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |

**هەنگاوی ٢**

لە ستوونی یەکەم ناوی چوار شت بنووسە کە دەتەوێت پێوانەی درێژییەکانیان بە سانتیمەتر بێت.

**هەنگاوی ٣**

درێژی شتەکان بە سانتیمەتر بخەملێنە، خەملاندنەکە لە ستوونی دووەم تۆماربکە.



**هەنگاوی ٤**

ڕاستەی سانتیممەتری بەکاربێنە بۆ پێوانی درێژی هەموو شتەکان بە نزیککراوەیی بۆ نزیکترین سانتیمەتر پێوانەکان لە ستوونی سێیەم تۆماربکە.

## پەیوەندی نێوان یەکەکانی درێژی

ئەو پەیوەندییانە چین کە سانتیمەتر و مەتر و کیلۆمەتر بەیەکەوە ،دەبەستنەوە.



١٠٠ سم = ١ م        ١٠٠٠ م = ١ کم

- ڕستەیەکی ژمارەیی بنووسە کە ڕێگەت پێدەدات بە دۆزینەوەی ژمارەی سانتیمەتر لە ٣ مەتر؟ (لەبیرتبێت ١٠٠ سم = ١م).

## ساغبکەوە

**١** ڕوونبکەوە  چۆن درێژی ئەو شتانەت زانی کە کۆتاییان ناکەوێتە سەر خاڵی سانتیمەتر؟

**درێژی شتەکە بە سانتیمەتر بخەملێنە، پاشان ڕاستە بەکاربێنە بۆ پێوانی درێژی بۆ نزیکترین سانتیمەتر.**

**٢** 

**٣**

**یەکەی پێوانی درێژی گونجاو چییە بۆ پێوانی ئەم شتانە؟ بنووسە سم یان م یان کم.**

**٤** پێنووس
**٥** پارچە تەباشیرێك
**٦** یاریگەی تۆپی پێ
**٧** ئەو دورییەی کە دەڕۆی لەیەك کاتژمێر

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

**خەملاندنی گونجاو هەڵبژێرە.**

**٨** درێژی پێنووس نزیکەی ٢٠ ـــ؟ـــ .
أ م    ب سم

**٩** درێژی ژووری پۆل نزیکەی ٣ ـــ؟ـــ .
أ کم    ب م

**ڕاستە بەکاربێنە بۆ کێشانی پارچە ڕاستەهێڵێك درێژییەکەی.**

**١٠** ٢ سم    **١١** ١٠ سم    **١٢** ١٤ سم

**١٣** **هەڵە لە کوێیە؟** گۆران وتی درێژی ئەم پارچە ڕاستە هێڵە ٢ سم.
هەڵەی گۆران لە کوێیە؟ درێژی پارچە ڕاستە هێڵەکە چەندە؟



## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٤** سەرمەد دەیەوێت دووری نێوان ماڵەکەی و یانەی وەرزشی کە دەکەوێتە دەرەوەی شار بپێوێت. کام یەکەی پێوان بەکاردەهێنێت؟

أ مەتر    ب کیلۆمەتر    ج سانتیمەتر    د گرام

وانەی ٦

# چێوە

## فێربە

**چێوە** شێوەیەکی ئەندازەییە، بریتییە لەو دوورییەی کە دەوری شێوەیەکی ئەندازەیی داوە. دەتوانی چێوەی کتێبی بیرکاری بپێوی.

### پێداچوونەوەی خێرا

١) ٦ + ٧ + ٢ = ▢

٢) ١ + ٨ + ٩ = ▢

٣) ٦ + ٦ + ٣ = ▢

٤) ٤ + ٤ + ٤ = ▢

### زاراوەکان

چێوە

## چالاکی ١

**هەنگاوی ١**

شێوەی لاکێشەیەك کراوەتە ٣ ڕیز هەر ڕیزەی ٥ کاشی چوار گۆشەییە، درێژی لایەکی هەر یەکەیان ١ سم.

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٦ | | | | | | ٦ |
| ١٥ | | | | | | ٧ |
| ١٤ | | | | | | ٨ |
| | ١٣ | ١٢ | ١١ | ١٠ | ٩ | |

**هەنگاوی ٢**

ژمارەی لاکانی دەرەوەی ئەو کاشییانەی کە دەوری لاکێشەکەیان داوە بژمێرە.

**هەنگاوی ٣**

ئەو ژمارەی دەستت کەوت تۆماری بکە. ئەمە چێوەی لاکێشەکەیە.

## چالاکی ٢

**هەنگاوی ١**

کاغەزگر لە چواردەوری کتێبەکە یەك لەدوای یەك دابنێ. لە پاشان کاغەزگرەکان بژمێرە. چێوەی کتێبەکە یەکسانە بە نزیکەی چەند کاغەزگر؟

بیرکاری

**هەنگاوی ٢**

دووبارە چێوەی کتێبی بیرکاری بەدەنکە شخاتە بپێوە، لەجیاتی کاغەزگر، دەنکە شخاتەکان بژمێرە، ژمارەیان بنووسە. چێوەی کتێبەکە یەکسانە بە چەند دەنکە شخاتە؟

- **دەرئەنجام** ئایا ئەو کاغەزگرانە کە بەکارت هێنا پتربوون یان کەمتربوون لە دەنکە شخاتە؟ ئایا دەتوانی ئەمە ڕوونبکەیتەوە؟

**نموونە** چێوەی ئەم شێوەیە چەندە؟




درێژی لاکان کۆبکەوە

١ سم + ٢ سم + ٢ سم + ١ سم + ١ سم + ١ سم = ٨ سم

چێوەی شێوەکە ٨ سم

## ساغبکەوە

١ ئایا دەتوانی تەنها بە پێوانی دوو لە لاکانی شێوەی نموونەی پێشوو چێوە بدۆزیتەوە؟ ڕوونیبکەوە.

چێوەی هەریەك لەم دوو شێوەیە یەكسانە بە چەند؟

٢



٣



## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

چێوەی هەریەك لەم شێوانە چەندە؟

٤



٥



٦



٧



٨ دنیا چەند چوار گۆشەیەکی ڕیزکرد، درێژی لایەکی هەریەکەیان ١ سم بوو، لاکێشەیەکی دەستکەوت لە ٥ ڕیز، هەر ڕیزی ٦ چوارگۆشە. چێوەی لاکێشەکە چەندە؟

٩ **ڕێنوێنی** درێژی چوارگۆشەیەك ٦سم بوو چێوەکەی چەندە؟

١٠ چێوەی لاکێشەیەك چەندە درێژی ٥م و پانی ٢ م بێت؟

١١ پەرەی چوارگۆشەیی بەکاربێنە بۆ پێوانی چێوەی لاکێشەیەکی ١٢ یەکە.

١٢ **جەبر** چێوەی سێگۆشەی خوارەوە ٨ سم ـە، درێژی لای سێیەمی چەند؟




## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

١٣ چێوەی شێوەی بەرامبەر چەندە؟



أ ٤ ب ١٢ ج ٨ د ١٠

وانەی ٧

# فراوانی

## پێداچوونەوەی خێرا

١ ٣٠٠ + ٤٠٠ = ▭

٢ ٨٠٠ + ١٠٠ = ▭

٣ ٢٠٠٠ + ٢٠٠٠ = ▭

٤ ٢٥٠ + ٢٥٠ = ▭

## زاراوەکان

فراوانی

## فێربە



**کام بەرداخ پەسنددەکەی؟** لەکاتی گەڕانەوەی هەڵۆ لە قوتابخانە. دایکی بە دوو پەرداخی جیاواز لە شەربەت پێشوازی لێکرد.

ئەگەر تۆ لە شوێنی هەڵۆ بیت کام بەرداخ هەڵدەبژێریت؟ بۆچی؟

هەندێ دەفر (ئامان) بەکاردێت بۆ هەڵگردنی شلەمەنییەکان، وەك ئاو و شیر و شەربەت. ئەو بڕە شلەمەنییەی کە دەفر دەیگرێت پێی دەوترێت **فراوانی** دەفرەکە.

- کام لەم دوو پەرداخە فراوانی گەورەترە؟

### یەدەستی چالاکی ١

چۆن فراوانترین شووشە دیاردەکەی؟



**هەنگاوی ١**

ئەو شووشەیە هەڵبژێرە کەلات دیارە فراوانییەکەی گەورەترە. پڕی بکە لەئاو.

**هەنگاوی ٢**

دەستبکە بە بەتاڵکردنی ئەو ئاوەی کە لەناو شووشەکەت کردبوو بۆ ناو شووشەکەی تر، تا شووشەی یەکەم بە تەواوی بەتاڵ دەبێت. ئەگەر هاتوو ئاوەکە ڕژا مانای وایە فراوانی شووشەی یەکەم گەورەترە، و ئەگەر شووشەی دووەم پڕ نەبوو مانای وایە شووشەی یەکەم بچووکترە.

- **دەرئەنجام** چی دەڵێی ئەگەر هاتوو شووشەی دووەمی بەتەواوی پڕکرد، بێ ئەوەی ئاوەکە بڕژێ؟

### یەدەستی چالاکی ٢

**کەرستەکان**: شووشەیەك ئاو و چەند پەرداخێکی پلاستیکی.



**هەنگاوی ١**

دەست بکە بە ئاو تێکردنە ناو پەرداخی یەکەم تا پڕدەبێت.

**هەنگاوی ٢**

بەردەوامبە لە ئاو تێکردنە ناو پەرداخەکان، جار لەدوای جار، تا ئاو لەناو شووشەکە نامێنێت. پاشان پەرداخە پڕەکان بژمێرە.

## ساغبکەوە

١ ڕوونبکەوە چۆن دەزانی کامیان گەورەترە؟ فراوانی شووشەی ئاو یان فراوانی قۆری چا؟

ئەو دەفرەی فراوانی گەورەترە دەوربدە.



٦ ئەگەر فراوانی قۆری چا ٥ کووپ بێت، فراوانی ٣ قۆری چەندە؟

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

ئەو دەفرە دەوربدە کە گەورەترین فراوانی هەیە.



١٠ **دەرئەنجام** کاوە پاکەتێك شیری هەیە ئایا دەتوانێ ٢٠ پەرداخ پڕبکات؟



١١ جەماڵ ژمارەیەك پوولی هەیە. دوو پوولی دا بە خوشکی، ئەوەی مایەوە لە ٤ ریز ڕێکخست، هەر ڕیزی ٣ پوول. ژمارەی پوولەکان هەمووی چەندە؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

١٢ کام لەمانەی خوارەوە خەملاندنی گونجاوە بۆ فراوانی شووشەیەك ئاو؟

أ دوو کووپ　ب ٣ کووپ　ج یەك کووپ　د ٤ کووپ

## شیکارکردنی پرسیارەکان　گۆشەی ڕووناکبیران

ڕاستە بەکاربێنە و درێژی دەزووەکان بپێوە.
لەجێگای هەر نیشانەیەکی پرس ئەو پیتە بنووسە
کە درێژی و ڕەنگ دەردەبڕێت.



ا　ئـ　ر　ه　ب　ی　ف　ن

مامۆستا چی دەڵێت بە قوتابی زیرەك؟

___ ___ ___ ___ ___ ___ ___

٢سم　٣سم　١سم　١سم　٢سم　٢سم　٣سم

وانەی ٨

# کێش



## پێداچوونەوەی خێرا

١ ٦٥ + ١٠ = ▢

٢ ١٠٠٠ + ٧٠٠٠ = ▢

٣ ٢٠٠ + ٦٠٠ = ▢

٤ ٦٠٠٠ + ٥٠٠٠ = ▢

## زاراوەکان

گرام (گم) | کیلۆگرام (کگم)

**کەرەستەکان** شتەکانی پۆل، کاغەزگری بچووک، تەرازووی سادە، کتێبێك کێشی نزیکەی یەك کیلۆگرام بێت.

## بدۆزەوە

**گرام (گم)** **کیلۆگرام (کگم)** دوو یەکەی پێوانەی کێشن.



کێشی کاغەزگر نزیکەی یەك گرامە.





کێشی کتێبێکی گەورە نزیکەی یەك کیلۆگرامە.

## چالاکی

هەندێ لە کەلوپەلی ژووری پۆل دەستنیشانبکە و کێشەکانیان دیاربکە.

**هەنگاوی ١**
١٠ کاغەزگر لەلایەکی تەرازووەکە دابنێ.
ئەو کاغەزگرانە ١٠ گرام دەنوێنن.

**هەنگاوی ٢**
لەلایەکی تری تەرازووەکە شتێك دابنێ بەبڕوای خۆت کێشی ١٠گرام بێت، خەملاندنەکەت ساغکەوە.

**هەنگاوی ٣**
هەنگاوی ١ و ٢ لەگەڵ کێشی نزیکەی ٢٥ گم، و نزیکەی یەك کگم دووبارەبکەوە، کتێب بەکاربێنە بۆ دیارکردنی یەك کگم.



کێشی گوارەیەکی زێڕ نزیکەی ٥ گمـە. ئایا دەتوانی شتێکی تر بڵێی کێشەکەی نزیکەی ٥ گم بێت؟

## هەوڵبدە

شتێك بڵێ کێشەکەی نزیکەی

أ ٥ گرام بێت

ب ٢ کیلۆگرام بێت

## بەیەکەوەبەستە



ئەگەر کێشی پشیلەیەك ٥ کگم بێت کێشەکەی بە گرام چەندە؟

١ کیلۆگرام = ١٠٠٠ گرام

کەواتە، کێشی پشیلەکە ٥٠٠٠گرامە

| کیلۆگرام | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
|---|---|---|---|---|---|
| گرام | ١٠٠٠ | ٢٠٠٠ | ٣٠٠٠ | ٤٠٠٠ | ٥٠٠٠ |

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

دەربڕینێکی گونجاو هەڵبژێرە.

**١**



٢٠٠ گم یان ٢٠٠ کگم؟

**٢**



١٨ گم یان ١٨ کگم؟

**٣**



٦ گم یان ٦ کگم؟

لەم لیستە، کەرەستەی گونجا ویەکەی پێوانی گونجاو هەڵبژێرە.

| کەرەسەکان | یەکە | |
|---|---|---|
| ڕاستە | سم | گم |
| بەرداخی ئاو | کگم | کوپ |
| تەرازوو | شوشە | م |

**٤** درێژی پێنووس

**٥** کێشی هێشوویەك ترێ

**٦** فراوانی پاکەتێك شیر

**٧** **بنووسە** ئایا ئەو شتانەی هەمان پێوانیان هەیە، هەمان کێشیان هەیە؟ نموونەیەك بێنە بۆ دڵنیابوونت لە وەڵامەکەت.

**٨** کێشی پشیلەی پەیوەند ٢ کگم کێشەکەی بە گرام چەندە؟

**٩** دیلان ٣ پێنووسی سوور و ٩ پێنووسی شینی هەیە. پێنووسەکانی بە یەکسانی دابەشی سەر دوو منداڵ کرد. چەند پێنووسی دا بەهەر منداڵێك؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٠** کام لەمانەی خوارەوە کێشەکەی بە گرام دەپێوی؟

[أ] کاغەزی کتێب [ب] شووتی [ج] مرۆڤ [د] ئەسپ

## شیکارکردنی پرسیارەکان



### کێ براوەیە؟



**کەرەستەکان**: کاغەز، دوو پێنووسی ڕەنگی جیاواز، شەشپاڵوویەکی ژمارەیی لەسەر ڕووەکانی ژمارەکانی ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، هەیە

یاریزانێك ٦ بازنەی دوور لەیەکتر لەسەر کاغەزەکە دەکێشێت.

[أ] یاریزانی یەکەم شەشپاڵووەکەی هەڵداو سەری پێنووسەکەی لەسەر یەکێك لە بازنەکان دادەنێ، پارچە ڕاستەهێڵێك دەکێشێت درێژییەکەی بە سانتیمەتر یەکسان بێ بەو ژمارەی کە دەستیکەوت، هەوڵدەدات لەگەڵ بازنەیەکی تر بیبەستێتەوە.

[ب] یاریزانی دووەم هەمان کرداری دووبارە کردەوە.

[ج] دوو یاریزانەکە بەردەوام دەبن و ڕۆڵی خۆیان دەگۆڕن یەك لەدوای یەك.

[د] ئەوەی دووبازنەی کۆتایی بەیەکتر ببەستێتەوە براوەیە.

بەشی ٧

# پێداچوونەوە

رِوو
لا
هێڵی هاوجێبوون
جووتەبن
لەیەکچوون
شەشپاڵوو

## دڵنیابوون لە زاراوەکان و چەمکەکان

دەربڕینی گونجاو لە لیستی بەرامبەر هەڵبژێرە.

١ ئەو رِووبەری تەختەیی لەسەر تەنی ئەندازەیی ئەمەیە ___؟___ ی تەنی ئەندازەییە.

٢ ئەو دوو وێنانەی هەمان پێکهاتە وهەمان پێوانەیان هەبێت ___؟___ .

٣ هەر راستە هێڵێکی نەبینراو شێوەیەك بکاتە دوو نیوەی یەکسان پێی دەوترێت ___؟___ ئەم شێوەیە.

٤ ئەو تەنە ئەندازەییە ٦ رِووی چوارگۆشەیی هەبێت، چییە؟

فراوانی
گرام
مەتر
چێوە
رِووبەر

دەربڕینی گونجاو لە لیستی بەرامبەر هەڵبژێرە.

٥ ___؟___ یەکێکە لە یەکەکانی پێوانەی درێژی.

٦ ___؟___ دەفر بریتییە لەو برِە ئاوەی کە دەفرەکە دەیگرێت.

٧ ___؟___ یەکێکە لە یەکەکانی پێوانەی کێش.

## دڵنیابوون لە کارامەییەکان



٨ ئەو تەنە ئەندازەییانە چین کە ئەو شتەی لێ پێکهاتووە؟

ئایا هێڵی شین هێڵی هاوجێبوونی شێوەکەیە؟ بنووسە بەڵێ یان نەخێر.

٩


١٠


١١


یەکەی پێوانی گونجاو چییە بۆ پێوانی هەریەك لەو شتانە؟ بنووسە سم یان م یان کم.

١٢ درێژی گێزەرێك

١٣ درێژی هەنگ

١٤ دووری مانگ

چێوەی هەریەك لەم شێوانە چەندە؟

١٥



١٦



١٧



## دڵنیابوون لە شیکارکردنی پرسیارەکان



وێنەی بەرامبەر بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی راهێنانی ١٨، ١٩.

١٨ ژمارەی چوارگۆشە شینەکان لەسەر هەموو رِووەکانی شەشپاڵووەکە چەندە؟

١٩ ژمارەی چوارگۆشە شینەکان و سپییەکان لەسەر هەموو رِووەکانی شەشپاڵووەکە چەندە؟

بەشی ٧

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**ئاگاداربە!**

- هەموو ناوەڕۆکەکە بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت لە پرسیارەکە.
- وەڵامەکانت ساغبکەوە.

**دەوری وەڵامی گونجاو بدە لە ڕاهێنانی ١ تا ٩.**

**١** کام تەنی ئەندازەیی ڕووی نییە، لای نییە، سەری نییە؟

أ لوولەک ج قووچەک
ب گۆ د شەشپاڵوو

**٢** کام پیت هێڵی هاوجێبوونی نییە؟

أ M ب P ج O د V

**٣** کام لەم شێوانە جووت دەبێ لەگەڵ ئەم شێوەیە؟

أ ب ج د

**٤** کام یەکەی پێوان بەکاردێت بۆ پێوانی کێشی تێبنووسەکەت؟

أ مەتر ب پەرداخ ج گرام د کاتژمێر

**٥** من تەنی ئەندازەییم، ٦ چوارگۆشەم هەیە، من چییم؟

أ هەرەم ج قووچەک
ب گۆ د شەشپاڵوو

**٦** کام شێوەی ئەندازەیی تەنها ٣ پارچەڕاستەهێڵی هەیە؟

أ سێگۆشە ج شەشپاڵوو
ب چوارگۆشە د هیچ لەوانە

**٧** چێوەی ئەم شێوەیە چەندە؟




أ ٥ سم ج ٧ سم
ب ١٢ سم د ٦٠ سم

**ستوونەکانی ڕوونکردنەوەیی بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانی ٨ و ٩.**




**٨** ئەو ڕەنگەی کەوا ٢٠ کەس پەسندیدەکەن کامەیە؟

أ سوور ج شین
ب سپی د زیوی

**٩** چەند کەس ڕای خۆیان دەربڕی؟

أ ٦٠ ج ٤٠
ب ٨٠ د هیتر

## ئەوەی دەیزانی بینووسە

**١٠** چوارگۆشەو لاکێشە لە چی پێکدەچن؟ وە لەچی جیاوازن؟

**١١** دوو شت بڵێ بەمەتر بپێورێن و دووشت بەگرام بکێشرێن.

**١٢** چۆن چێوەی ئەم لاکێشەیە دەدۆزیەوە؟ چێوەکەی یەکسانە بە چەند؟



بەشی ٨

# کەرتەکان

| درێژی مێروولەکان | |
|---|---|
| مێروولە | درێژییەکەی |
| مێروولە | $\frac{٢}{٣}$ سم |
| مێشوولە | $\frac{١}{٣}$ سم |
| خاڵخاڵۆکە | ٥ سم |
| قالۆچە | ١١سم |

هەزاران چەشنە مێروولە لە جیهاندا هەیە، هەندێکیان قەبارەیان گەورەیە و هەندێکیان لە قەبارەدا بچووکن و بەچاو نابینرێن.

**پرسیار بۆ شیکارکردن:** ئەم خشتەیەی بەرامبەر بەشێك لە مێروولەکان درێژییەکانیان دیاردەکات..
کام مێروولە کورتترینیانە؟
کام مێروولە درێژترینیانە؟



# زانیارییەکانت ساغبکەوە



ئەم لاپەڕیە بەکاربهێنە بۆ دڵنیابون لە هەبوونی
ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە لەم بەشە

## نواندنی پارچەکانی گشت

ژمارەی پارچە یەکسانەکان چەندە؟ ژمارەی پارچە ڕەنگنەکراوەکان چەندە؟

١



٢



٣



٤



ژمارەی پارچە یەکسانەکان چەندە؟ ژمارەی پارچەڕەنگکراوەکان چەندە؟

٥



٦



## پارچەکانی کۆمەڵە

ژمارەی شتەکانی هەر کۆمەڵەیەك چەندن؟ ژمارەی ئەو شتانەی کە سەوزنین لە کۆمەڵەکەدا چەندن؟

٧



٨



ژمارەی شتەکانی هەر کۆمەڵەیەك چەندە ژمارەی شتە سەوزەکان لە کۆمەڵەکەدا چەندن؟

٩



١٠



## ناونانی کەرتەکان

ئەو کەرتە بنووسە کە پارچە ڕەنگکراوەکە دەنوێنێ.

١١



١٢



١٣



## بەراوردکردنی کەرتەکان

بەراورد بکە. > یان < لە ● دابنێ.

١٤



١٥



١٦



وانەی ١

# کەرتی یەکە

## پێداچوونەوەی خێرا

ژمارەی دواتر لەهەر شێوازێکدا چەندە؟

١ ٢، ٤، ٦، ٨،

٢ ١٢، ١١، ١٠، ٩،

٣ ٣، ٦، ٩، ١٢،

٤ ١١، ٩، ٧، ٥،

## زاراوەکان

کەرت سەرە ژێرە

## فێربە

لەکاتی بەشکردنی شتێك بۆ چەند بەشێکی یەکسان ئەوا نواندنی هەر پارچەیەك لە پارچەکانی بە هۆی **کەرت** پێی دەوترێ **کەرتی یەکە**.



سەیری وێنەی پیتزاکە بکە، کام کەرت ئەو پارچەیە دەنوێنێ کە بەزالیای لەسەرە.

یەك پارچە بەزالیای تێدایە ← ١ → سەرە

ژمارەی بەشە یەکسانەکان ← ٦ → ژێر

| ١ | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٦}$ |

**بخوێنەوە**: شەشیەك یەك $\frac{١}{٦}$

بەشێك لە ٦ بەشی یەکسان

١ لە ٦

کەواتە، $\frac{١}{٦}$ی پیتزا بەزالیای تێدایە.

**سەرە** ژمارەی بەشە ژماردراوەکان دەنوێنێ.

**ژێرە** ژمارەی بەشە یەکسانەکانی شتەکە دەنوێنێ.

- ئەم کەرتە چییە کە ئەو بەشەی بیتزا دەنوێنێ کە بەزالیای تێدایە؟



**نموونە** دەتوانی هەر شتێك بەشبکەی بۆ چەند پارچەیەکی یەکسان



## ژماردنی پارچە یەکسانەکان

دەتوانی پارچە یەکسانەکان بژمێری وەك شەشیەك، تا شتێکی تەواوت دەستدەکەوێت.



دەتوانی هێڵی ژمارەکان بەکاربێنی بۆ نواندنی کەرتی یەکە.



خاڵی • شوێنی کەرتی $\frac{٥}{٦}$ دیاردەکات.

### نموونە

أ هێڵی ژمارەکان بەشکراوە بۆ (سێیەکی)



خاڵی • شوێنی کەرتی $\frac{١}{٣}$ دیاردەکات.

ب هێڵی ژمارەکان بەشکراوە بۆ (چواریەکی)



خاڵی • شوێنی کەرتی $\frac{٣}{٤}$ دیاردەکات.

### ساغبکەوە

١ ڕوونیبکەوە چۆن (هەشتیەك) دەژمێری بۆ ئەوەی یەکێ دەستکەوێت؟

ئەو کەرتەی بەشە ڕەنگکراوەکە دەنوێنێ لەسەر شێوەی پیتی و ڕەنووسی بنووسە.

٢ ٣ ٤



### ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

ئەو کەرتە بنووسە کە بەشە ڕەنگکراوەکان دەنوێنێ بە ڕەنووسی (بەبەکارهێنانی سەرە وژێرە) و بەپیت (بە بەکارهێنانی پیتەکان)

٥ ٦ ٧

٨ ٩ ١٠



جەبر  کەرتە نادیارەکانی سەر هێڵی ژمارەکان بنووسە.

**١١**




**١٢**




ئەو کەرتە بنووسە کە بەشە دەوردراوەکە دەنوێنێ.

**١٣**



**١٤**



**١٥**



**١٦** وێنەی ٩ بازنە بکێشە دەوری $\frac{1}{3}$ی بازنەکان بدە.

**١٧** کوا هەڵە؟ شنە ووتی ئەو کەرتەی بەشە ڕەنگکراوەکە دەنوێنێ یەکسانە بە $\frac{1}{2}$، شنە لە کوێ هەڵەی کردووە؟



## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٨** نارین کولێرەیەکی کردە ٨ پارچەی یەکسان. پارچەیەکی خوارد و دوو پارچەی دا بە خوشکەکەی، چ کەرتێك ماوە دیاردەکا؟

أ $\frac{5}{8}$  ب $\frac{3}{8}$  ج $\frac{2}{8}$  د $\frac{1}{8}$

## شیکارکردنی پرسیارەکان  دەروازەیەك لەسەر گەشتی دەریایی

کەشتییەوانەکان (پاپۆڕەوان) زمانی تایبەتی بەکاردێنن بۆ گفتوگۆکردن ئالآیەکان بەکاردێنن لە جیاتی وشەکان. هەر ئالآیەك لەم ئالآیانە لە جیاتی پیتێك لە پیتەکانی ئەبجەدی ئینگلیزی بەکاردێت. ئەگەر هاتوو گەشتییەکە ئالآی پیتی P بەرزکردەوە مانای ئەوەیە کەشتیەکە دەیەوێ لە بەندەرەکە دەربچێ.




وێنەی بەرامبەر بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانەکان.

أ سەیری پیتی G بکە. ئەو کەرتە چەندە کە پارچە ڕەنگە زەردەکەی ئالآیەکە دەنوێنێ؟

ب سەیری هەموو ئالآکان بکە. کام ئالآ کراوەتە چوار پارچەی یەکسان واتە چوار یەکی؟

ج سەیری پیتی N بکە. ژمارەی پارچە یەکسانەکانی ئەم ئالآیە چەندن؟

د کەرتێك بنووسە کە پارچەیەك لە پارچەکان ئالآی هەریەك لەم پیتانە دیاردەکات: T, O, L.

وانەی ٢

# هاوتابوونی کەرتەکان



## پێداچوونەوەی خێرا

ناوی ئەو کەرتە بڵێ کە پارچە ڕەنگکراوەکە دیادەکات.




## زاراوەکان

کەرتە هاوتاکان

## فێربە

**پارچە یەکسانەکان** **کەرتە هاوتاکان** ئەو کەرتانەن کە هەمان هێندە دەنوێنن.

ئایا کەرتی تر هەیە هەمان هێندەی هەبێت کە کەرتی $\frac{١}{٢}$ هەیەتی؟

### چالاکی ١

**کەرەستەکان:** کاغەزێکی لاکێشەیی.

**هەنگاوی ١**

کاغەزەکە یەك جار بنووشتینەوە لە دواییدا بیکەوە. وێنەی خوارەوەت دەستدەکەوێت یەکێك لە دوو بەشەکانی شین بکە.



بەشێك لە دوو بەشە یەکسانەکانی شینە. $\frac{١}{٢}$ی کاغەزەکە شینە دووبارە کاغەزەکە بنووشتێنەوە

**هەنگاوی ٢**

جارێکی تر کاغەزەکە بنووشتێنەوە وبیکەوە ئەم شێوەت دەستدەکەوێت.



**سەرنجبدە:** دووبەش لە ٤ بەشی یەکسان شینە. $\frac{٢}{٤}$ی کاغەزەکە شینە. کاغەزەکە دووبارە بنووشتێنەوە.

**هەنگاوی ٣**

بۆ جاری سێیەم کاغەزەکە بنوشتێنەوە. بیکەوە ئەم شێوەت دەستدەکەوێت.



**سەرنجبدە:** ٤ پارچە لە ٨ پارچەی یەکسان شینە. $\frac{٤}{٨}$ ی کاغەزەکە شینە.



کەواتە $\frac{١}{٢} = \frac{٢}{٤} = \frac{٤}{٨}$

کەرتەکانی $\frac{١}{٢}$ و $\frac{٢}{٤}$ و $\frac{٤}{٨}$ هەموویان هەمان هێند دەنوێنن. کەرتەکان هاوتان.

$\frac{١}{٢}$ و $\frac{٢}{٤}$

دووکەرتی هاوتان





$\frac{١}{٢} = \frac{٢}{٤}$

## ساغبکەوە

**١** ڕوونیبکەوە چۆن بەبەکارهێنانی شریتی کەرتەکان دەزانی کەوا کەرتی $\frac{٢}{٤}$ و $\frac{٢}{٣}$ هاوتان یان نا؟

**٢** ئایا هەردوو کەرتی $\frac{٢}{٣}$ ، $\frac{٣}{٤}$ هاوتان؟

**٣** ئایا هەردوو کەرتی $\frac{٣}{٤}$ ، $\frac{٣}{٥}$ هاوتان؟







کەرتێك هاوتای هەر کەرتێك بنووسە:

**٤** $\frac{٤}{٦}$




**٥** $\frac{٢}{٥}$




## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

**شریتی کەرتەکان بەکاربهێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانی ٦ تا ١٠.**




**٦** کەرتێك بنووسە هاوتای کەرتی $\frac{٢}{٦}$ .

**٧** کەرتێك بنووسە هاوتای کەرتی $\frac{٣}{٦}$ .

**٨** کەرتێك بنووسە هاوتای کەرتی $\frac{٥}{٥}$ .

**٩** ئایا هەردوو کەرتی $\frac{٤}{٥}$ ، $\frac{٥}{٦}$ هاوتان؟

**١٠** لە نێوان هەرسێ کەرتی $\frac{٣}{٥}$ ، $\frac{٤}{٦}$ ، $\frac{٦}{١٠}$ دوو کەرتیان هاوتان، کام دوو کەرتە؟

**١١** تەمەنی زێرین ژمارەیەکی جووتە دەکەوێتە نێوان ٢٠ و ٢٩ و بەسەر ٣ دا دابەش دەبێ بەبێ ماوە ئایا تەمەنی زێرین چەندە؟

**١٢** زانا حەز لە خواردنی پرتەقال و ترێ دەکات. بەڵام حەز لە خواردنی سێو و خۆخ ناکات کەرتی کۆمەڵەی چوار مێوەکەی کە زانا حەزلێدەکات چییە؟

**١٣** جەبر بەرزیی تاوەری ئیڤل لە پاریس ٣٣٠ مەترە و بە ٣٠ مەتر بەرزترە لە تاوەری شانشین لە ریاز ئایا بەرزیی تاوەری شانشین چەندە؟

**١٤** **بنووسە** چۆن شریتی کەرتەکان بەکاردێنی بۆ دۆزینەوەی کەرتی هاوتا بە کەرتی $\frac{٤}{٨}$؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٥** کام کەرت هاوتای $\frac{٤}{٦}$؟

أ $\frac{٣}{٤}$ ب $\frac{٢}{٣}$ ج $\frac{٦}{١٢}$ د $\frac{١}{٢}$

وانەی ٣

# بەراوردکردنی کەرتەکان و ڕیزکردنیان



## پێداچوونەوەی خێرا

بەراورد بکە. هێمای > یان < یان = لە شوێنی ● دابنێ.

١ ٣٩٨ ● ٣٩٩

٢ ٢٤١ ● ٢١٤

٣ ٤٠١٢ ● ٤٠١٢

٤ ٥٤٣١ ● ٥٣٤١

**فێربە**

**کام پارچە گەورەترینە؟** دەتوانی شریتی کەرتەکان بەکاربێنی بۆ بەراوردکردنیان.

### نموونە

أ $\frac{١}{٤}$ و $\frac{٢}{٤}$ بەراورد بکە



شریتی $\frac{١}{٤}$ کورتترە لە شریتی $\frac{٢}{٤}$

کەواتە، $\frac{١}{٤} < \frac{٢}{٤}$ یان $\frac{٢}{٤} > \frac{١}{٤}$.

ب $\frac{١}{٣}$ و $\frac{١}{٤}$ بەراورد بکە



شریتی $\frac{١}{٤}$ کورتترە لە شریتی $\frac{١}{٣}$

کەواتە، $\frac{١}{٤} < \frac{١}{٣}$ یان $\frac{١}{٣} > \frac{١}{٤}$.

- شریتی کەرت چیلێدێت لە کاتی گەورەبوونی ژێرە، درێژ دەبێت یان کورت؟

دەتوانی چوارگۆشەی بچووک بەکاربێنی بۆ بەراوردکردنی پارچەکانی کۆمەڵە.

### نموونە

أ $\frac{٢}{٥}$ و $\frac{٣}{٥}$ بەراورد بکە



دوو چوارگۆشە بچووکترە لە ٣ چوارگۆشە.

کەواتە، $\frac{٢}{٥} < \frac{٣}{٥}$ یان $\frac{٣}{٥} > \frac{٢}{٥}$.

ب $\frac{٤}{٦}$ و $\frac{٢}{٣}$ بەراورد بکە



٤ چوارگۆشە لەسەرەوە و ٤ چوارگۆشە لە ژێرەوە.

کەواتە، $\frac{٤}{٦} = \frac{٢}{٣}$.

- چۆن بەراوردی دوو کەرت دەکەیت کە هەمان ژێرەیان هەبێت؟ چۆن بەراوردی دوو کەرت دەکەیت ژێرەیان جیاوازبێت؟

## ڕیزکردنی کەرتەکان



دەتوانی دوو کەرت یان پتر ڕیزبکەی، لە بچووکترینەوە بۆ گەورەترین یان بە پێچەوانەوە. شاناز پێویستی بە $\frac{٣}{٨}$ ی پەرداخ لە مێوژ و $\frac{١}{٤}$ ی پەرداخ لە شوکولاتە و $\frac{٢}{٣}$ ی پەرداخ لە بندق هەیە بۆ دروستکردنی شیرینی، شاناز دەیەوێ بزانێ کام جۆری پتر پێویستە. شریتی کەرتەکان بەکاربێنە بۆ ڕیزکردنی هەر سێ کەرتەکە لە گەورەترینەوە بۆ بچووکترین.

### نموونە

**هەنگاوی ١**

کەرتەکان بەراوردبکە.



$\frac{٣}{٨} < \frac{٢}{٣}$

$\frac{١}{٤} < \frac{٣}{٨}$

**هەنگاوی ١**

کەرتەکان بەرەوژێر ڕیزبکە لە گەورەترین بۆ بچووکترین.

بیربکەوە: $\frac{١}{٤} < \frac{٣}{٨} < \frac{٢}{٣}$

بیربکەوە: $\frac{١}{٤}$ ، $\frac{٣}{٨}$ ، $\frac{٢}{٣}$

کەواتە ڕیزی کەرتەکان لە گەورترینەوە بۆ بچووکترین بریتییە لە: $\frac{١}{٤}$ ، $\frac{٣}{٨}$ ، $\frac{٢}{٣}$

- هەر سێ کەرتەکانی پێشوو لە بچووکترینەوە بۆ گەورەترین ڕیزبکە.

### ساغبکەوە

بەراورد بکە. هێمای > یان < یان = لە شوێنی ● دابنێ.

**١**





$\frac{١}{٣}$ ● $\frac{٢}{٣}$

**٢**





$\frac{٣}{٥}$ ● $\frac{٢}{٥}$

**٣**





$\frac{٣}{٦}$ ● $\frac{٣}{٤}$

## ◀ ڕاهێنــان و شیـکـارکـردنـی پـرسـیـارەکـان

بەراورد بکە. هێمای > یان < یان = لە شوێنی ● دابنێ.

**٤**

| $\frac{١}{٢}$ | | $\frac{١}{٢}$ | |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٤}$ | $\frac{١}{٤}$ | $\frac{١}{٤}$ | $\frac{١}{٤}$ |

$\frac{١}{٢}$ ● $\frac{١}{٤}$

**٥**

| $\frac{١}{٨}$ | $\frac{١}{٨}$ | $\frac{١}{٨}$ | $\frac{١}{٨}$ | $\frac{١}{٨}$ | $\frac{١}{٨}$ | $\frac{١}{٨}$ | $\frac{١}{٨}$ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٤}$ | | $\frac{١}{٤}$ | | $\frac{١}{٤}$ | | $\frac{١}{٤}$ | |

$\frac{٣}{٤}$ ● $\frac{٦}{٨}$

**٦**

| $\frac{١}{٥}$ | $\frac{١}{٥}$ | $\frac{١}{٥}$ | $\frac{١}{٥}$ | $\frac{١}{٥}$ | |
|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٦}$ |

$\frac{٣}{٦}$ ● $\frac{٣}{٥}$

**٧** نەشمیل وتی کەرتی $\frac{٥}{١٠}$ گەورەترە لە کەرتی $\frac{٥}{٦}$ چونکە ١٠ گەورەترە لە ٦ ئایا لەگەڵ بۆچوونی ئەوەدای؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەوە.

**٨** شێوازی دێت تەواو بکە:

$\frac{١}{٨}$، $\frac{٢}{٨}$، $\frac{٣}{٨}$، $\frac{٤}{٨}$، $\frac{٥}{٨}$، ■، ■

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**٩** کام لەمانەی خوارەوە هەڵەیە؟

أ $\frac{٦}{٨} = \frac{٣}{٤}$ ب $\frac{٤}{٨} > \frac{٣}{٨}$ ج $\frac{٤}{٥} < \frac{٢}{٥}$ د $\frac{٤}{٨} = \frac{٣}{٦}$

## شیکارکردنی پرسیارەکان — دەروازەیەك بۆ زانستە مرۆییەکان

أ سەیری ئەو حەوت مۆمی سەر مێزەکە بکە. ٣ لەوانە سوور و یەکێکیان ڕەشە. ئەوانیتر سەوزن. ئەو کەرتە چییە کە مۆمە سەوزەکان دەردەبڕێت؟



ب کرمانج $\frac{٣}{٤}$ ی پەرداخێك ترێ، و $\frac{١}{٢}$ ی پەرداخێك شلیك و $\frac{١}{٤}$ ی پەرداخێك گێلاسی خوارد. شریتی کەرتەکان بەکاربێنە بۆ ڕێکخستنی میوەکان بەرەوژوور.

وانەی ٤

# کەرتەکان و دەییەکان

## پێداچوونەوەی خێرا

هەریەك لەم کەرتانە بە شێوەی پیتی بنووسە.

١ $\frac{١}{٣}$ ٢ $\frac{٢}{٥}$

٣ $\frac{٢}{١٠}$ ٤ $\frac{٣}{٨}$

## زاراوەکان

دەیەك

ژمارەی دەیی

## فێربە

ئەو کەرتە چەندە کە بەشە ڕەنگکراوەکەی ئەم چوارگۆشەیە دەنوێنێ؟



ئەم چوارگۆشەیە کراوەتە ١٠ بەشی یەکسان،

بەشێك لەم بەشانە بریتییە لە $\frac{١}{١٠}$ یان دەیەك.

بەشە ڕەنگکراوەکە ٤ دەیەکی دیار دەکات یان $\frac{٤}{١٠}$.

دەتوانی ئەم هێندە لەسەر شێوەی ژمارەی دەیی: ٠,٤ بنووسی

ژمارەی ٠,٤ **ژمارەیەکی دەییە.**

٠,٤

شێوەی دەیی

وێرگوڵ (فاریزە)

| شێوەی کەرتی | شێوەی دەیی |
| --- | --- |
| **بنووسە:** $\frac{٤}{١٠}$ | **بنووسە:** ٠,٤ |
| **بخوێنەوە:** ٤ دەیەك یان ٤ لە دە | **بخوێنەوە:** چوار دەیەك یان سفر فاریزە ٤ |

کەرتی $\frac{٤}{١٠}$ و ژمارەی ٠,٤ دوو نووسینن مانای هەمان هێند دیاردەکەن.

**لە بیرمەکە** دەتوانی نووسینی کەرتی یان نووسینی دەیی بەکاربێنی بۆ دیارکردنی دەییەکان.

## نموونە

أ



شێوەی دەیی: ٠,٩

دەخوێنمەوە: نۆ دەیەك یان ٩ لە ١٠ یان سفر وێرگوڵ (فاریزە) ٩.

ب



شێوەی دەیی: ٠,١

دەخوێنمەوە: دەیەك یان ١ لە ١٠ یان سفر فاریزە ١.

ج



شێوەی دەیی: ١,٠

دەخوێنمەوە: دە دەیەکی یان یەك یان ١٠ لە ١٠ یان یەك وێرگوڵ سفر یان یەك.

- چەند پارچە لە پارچەکانی چوارگۆشە پێویستە ڕەنگبکرێت بۆ نواندنی ٠,٣؟

## ساغبکەوە

**١** کەرتێك بنووسە ئەو پارچەیە بنوێنێت کە چرا خواردویەتی لە شیرینییەکە، پاشان ئەو ژمارە دەییە بنووسە کە ئەو پارچەیە دیاردەکات.

**کەرت و ژمارە دەییەکە بنووسە کە پارچە ڕەنگکراوەکان دیاردەکات.**




## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

**کەرت و ژمارە دەییەکە بنووسە کە پارچە ڕەنگکراوەکان دیاردەکات.**




**١١** **ڕێنوێنی** سەیری پرسیاری ٨ بکە چۆن لێکدەرکردن بەکاردێنی بۆ دۆزینەوەی ژمارەی دەیی کە پارچە ڕەنگنەکراوەکە دیاردەکات؟

**١٢** **بنووسە** سەیری دوو شریتەکەی کەرت بکە. ڕوونیبکەوە بۆچی؟ ٠,٥ وە $\frac{١}{٢}$ هەمان هێند دەنوێنن؟



### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٣** کام لەمانەی خوارەوە بەشە ڕەنگکراوەکە دەنوێنێ؟

أ ٣ ب ٧ ج ٠,٣ د ٠,٧



وانەی
٥

# ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان

## نموونەیەك دروستبکە



**پێداچوونەوەی خێرا**

بەراورد بکە. هێمای > یان < یان = لە شوێنی ● دابنێ.

١) $\frac{٢}{٣}$ ● $\frac{٢}{٣}$  ٢) $\frac{٤}{٦}$ ● $\frac{٣}{٦}$

٣) $\frac{١}{٤}$ ● $\frac{١}{٢}$  ٤) $\frac{٤}{٨}$ ● $\frac{٥}{١٠}$

**پرسیار** ٣ منداڵ بەشداریان لە ڕاکردنی پۆستەکرد، ئازاد $\frac{٢}{٣}$ ی کم ڕایکرد و نەوزاد $\frac{٧}{٨}$ ی کم ڕایکرد و مەریوان $\frac{٥}{٦}$ ی کم ڕایکرد. ئایا لەم هاوڕێیانە کامەیان زیاتر ڕایکردووە؟

### تێبگە

- داواکراو چییە؟
- ئەو پێدراوانە چیین کە بەکاریان دەهێنیت؟
- ئایا پێدراو هەیە کە بەکارت نەهێنابێ؟ چییە؟



### پلاندابنێ

- کام ڕێگا بەکاردەهێنی بۆ شیکارکردنی پرسیارەکە.

دەتوانی ڕێگەی «نموونەیەك دروست بکە» بەکاربهێنی بۆ دیاریکردنی ئەو بەشەی کیلۆمەتر کە هەریەك لە منداڵەکان ڕایکردووە.

### شیکاربکە

- چۆن ئەم نموونەیە دروستدەکەیت؟

شریتی کەرتەکان بەکاربێنە بۆ دروستکردنی نموونەی پرسیارەکە. شریتەکە وا دابنێ بە شێوەیەك کە لە هەمان هێڵی ستوونی دەستپێبکە.

بەراوردی درێژییەکانی شریتی کەرتەکان بکە.

لەبەر ئەوەی $\frac{٧}{٨} > \frac{٥}{٦} > \frac{٢}{٣}$ کەواتە، نەوزاد لە هەردوو هاوڕێیەکانی زیاتر ڕایکردووە.

ئازاد



نەوزاد



مەریوان



### ساغبکەوە

- چ ڕێگایەکی تر دەتوانی بەکاربێنی بۆ شیکارکردنی ئەم پرسیارە؟

## ڕاهێنــان و شیکـارکـردنـی پرسیـارەکـان

**ڕێگەی «نموونەیەك دروستبکە» بەکاربێنە بۆ شیکاکردنی پرسیارەکانی ١ و٢.**

**١** ئەگەر ئازاد $\frac{٩}{١٠}$ کم ڕابکات ئایا ئەوە دەگەیەنێ کە لە هەردوو براەدرەکەی زیاتر ڕایکردووە؟

**٢** دونیا $\frac{٢}{٣}$ی پەرداخ شیر و $\frac{١}{٤}$ی پەرداخ شەکر و $\frac{١}{٢}$ پەرداخی ئاوی بەکارهێنا بۆ دروستکردنی پارچەیەك شیرینی. ئەو جۆرە چییە کە لە هەموویان زیاتر بەکاریهێناوە؟

**مامۆستای زانست لە قوتابییەکانی داواکرد کتێبێك بخوێننەوە دەربارەی مێرووەکان. پاش هەفتەیەك، توانا $\frac{١}{٢}$ی کتێبەکەی خوێندەوە و بەنگین $\frac{٢}{٥}$ی کتێبەکەی خوێندەوە و چرا $\frac{٣}{٨}$ی کتێبەکەی خوێندەوە.**

**٣** کام ڕیزبەندی ڕاستە؟

أ $\frac{٣}{٨} > \frac{٢}{٥} > \frac{١}{٢}$

ب $\frac{١}{٢} > \frac{٢}{٥} > \frac{٣}{٨}$

ج $\frac{١}{٢} > \frac{٣}{٨} > \frac{٢}{٥}$

د $\frac{٢}{٥} > \frac{٣}{٨} > \frac{١}{٢}$

**٤** کامیان گەورەترین بەشی کتێبەکەی خوێندۆتەوە؟

أ توانا

ب بەنگین

ج چرا

### ڕێگەکانی شیکارکردنی پرسیار

هێلکاریەك یا وێنەیەك بکێشە

**نموونەیەك دروستبکە یان بەکردار جێبەجێبکە**

لیستێکی ڕێك دروست بکە

بەدوای شێوازێك بگەرێ

خشتەیەك یان وێنەیەکی ڕوونکردنەوەیی دروستبکە.

بخەملێنە وساغبکەوە

بەهەنگاوەکاندا بگەرێوە

پرسیاری ئاسانتر شیکاربکە

ڕستەیەکی ژمارەیی بنووسە.

دەرئەنجامی ژیربێژی بەکاربێنە




## ڕاهێنان بە چەند ڕێگایەکی جیاواز

**٥** دەرئەنجام محەمەد کاغەزێکی دەفتەرەکەی نوشتاندنەوەی بۆ دوو نیوە. دووجار لەسەر یەك، لەدوایدا کردیەوە، یەکێك لە بەشە یەکسانەکانی ڕەنگکرد کە دەستیکەوەوتبوو. ئایا ئەو کەرتەی بەشە ڕەنگکراوەکە دەنوێنێ چییە؟

**٦** ژیار ٧٤ ئۆتۆمبێلی بچووکی هەیە، ٢٦ی گۆڕیەوە بە ١٢ ئۆتۆمبێل لەگەڵ سۆران. ئایا ئیستا ژمارەی ئۆتۆمبێلەکانی چەندە؟

وانەی
٦




# کۆکردنەوەی کەرتەکان



**پێداچوونەوەی خێرا**

کەرتێکی هاوتا بڵێ.

١ $\frac{٤}{٦}$ ٢ $\frac{٢}{٨}$

٣ $\frac{٢}{٤}$ ٤ $\frac{٢}{١٠}$

**زاراوەکان**

کەرتە ژێرە یەکسانەکان

**کەرستەکان** شریتی کەرتەکان

## فێربە

ئەو کەرتانەی کە هەمان ژێرەیان هەیە بریتین لە **کەرتە ژێرە یەکسانەکان.**

شنۆ و دایکی دەیانەوێ شەربەتێکی مێوی تێکەڵاو دروستبکەن بە تێکەڵ کردنی $\frac{١}{٤}$ پەرداخ لە شەربەتی پرتەقاڵ لەگەڵ $\frac{٢}{٤}$ پەرداخ لە شەربەتی ئەناناس، ئەو برە شەربەتە داواکراوە چەندە بۆ دروستکردنی تێکەڵاوەکە؟

**لە بیرمەکە**

١ ⟵ سەرە
٢ ⟵ ژێرە

## چالاکی

شریتی کەرتەکان بەکاربهێنە بۆ ژماردنی $\frac{٢}{٤} + \frac{١}{٤}$ .

**هەنگاوی ١**

شریتی کەرتەکان بەکاربهێنە بۆ نواندنی $\frac{٢}{٤}$ .



$\frac{٢}{٤}$

**هەنگاوی ٢**

ئەو شریتەی $\frac{١}{٤}$ دەنوێنێ زیادبکە.



$\frac{٢}{٤} + \frac{١}{٤}$

**هەنگاوی ٣**

ئەو شریتانەی $\frac{١}{٤}$ دەنوێنن بژمێرە.



$\frac{١}{٤}$ ، $\frac{٢}{٤}$ ، $\frac{٣}{٤}$ یان $\frac{٢}{٤} + \frac{١}{٤} = \frac{٣}{٤}$

- بۆچی ژێرە ناگۆڕێت لە کاتی کۆکردنەوەی دوو کەرتەکە؟
- **ڕوونیبکەوە** چۆن شریتی کەرتەکان بەکاردەهێنی بۆ ئەنجامدانی $\frac{١}{٣} + \frac{١}{٣}$ ؟

شریتی کەرتەکان دەژمێرم بۆ ئەوەی سەرجەمم دەستبکەوێت $\frac{١}{٦}$ ، $\frac{٢}{٦}$ ، $\frac{٣}{٦}$ کەرتی دواتر چەندە؟

## هەوڵبدە

شریتی کەرتەکان بەکاربهێنە بۆ هەژمێرکردنی سەرجەم.

أ $\frac{٣}{٦} + \frac{١}{٦}$ ب $\frac{٣}{٥} + \frac{٢}{٥}$



## بەیەکبەستەوە

کۆکردنەوەی کەرتە ژێرە یەکسانەکان.

### نموونە

سەرکەوت پرتەقاڵێکی پاککرد، ٨ پارچەی دەستکەوت یەك پارچەی خوارد، واتە $\frac{١}{٨}$ی پرتەقاڵەکە. لە دواییدا ٤ پارچەی تری خوارد، واتە $\frac{٤}{٨}$. ئەو کەرتە چەندە سەرجەمی خواردنەکانی سەرکەوت دەنوێنێ؟

**هەنگاوی ١**

ژمارەی ئەو پارچانەی کە سەرکەوت خواردویەتی کۆبکەوە.



١ + ٤

**هەنگاوی ٢**

یەك پارچە + ٤ پارچەی = ٥ پارچەی

$\frac{١}{٨} + \frac{٤}{٨} = \frac{٥}{٨}$

کەواتە سەرکەوت $\frac{٥}{٨}$ی پرتەقاڵەکەی خواردووە.

**لەبیرمەکە** بۆ ئەوەی کەرتەکانی ژێرە یەکسانەکان کۆبکەیتەوە، سەرەکان کۆبکەوە، ژێرەش وەك خۆی بهێڵەوە.

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

سەرجەم چەندە؟

١ 

$\frac{٢}{٥} + \frac{١}{٥} = \square$

٢ 

$\frac{٣}{٨} + \frac{٣}{٨} = \square$

٣ 

$\frac{١}{٣} + \frac{١}{٣} = \square$

شریتی کەرتەکان بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی سەرجەم.

٤ $\frac{٢}{٥} + \frac{٢}{٥} = \square$

٥ $\frac{١}{٦} + \frac{٤}{٦} = \square$

٦ $\frac{٤}{١٠} + \frac{٣}{١٠} = \square$

٧ $\frac{٣}{٨} + \frac{٢}{٨} = \square$

٨ دلسۆز ٦ زەردەلو و ٢ سێوی هەبوو. دوو سێوی تری کڕی. ئەو کەرتەی کە سێوەکان دەنوێنێ چەندە لە نێوان هەموو ئەو میوەیەی کە دلسۆز هەیەتی؟

٩ ئامادەکردنی هەندێ لەشت پێویستی بە $\frac{١}{٤}$ی پەرداخ شەکر هەیە. ئەگەر بمانەوێ برِەکە دوو ئەوەندە بکەین چەند شەکرمان پێویستە؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

١٠ $\frac{٧}{٨} + \frac{٣}{٨} = \square$ .

أ $\frac{١٠}{١٦}$ ب $\frac{١٠}{٨}$ ج $\frac{٤}{٨}$ د $\frac{٦}{٨}$

وانەی ٧

# سادەکردنی سەرجەم

## پێداچوونەوەی خێرا

بەراوردبکە. هێمای > یان < یان = دابنێ لە شوێنی ●.

١ $\frac{٥}{٨}$ ● $\frac{٧}{٨}$  ٢ $\frac{٣}{٦}$ ● $\frac{١}{٢}$

٣ $\frac{٦}{١٠}$ ● $\frac{٢}{٥}$  ٤ $\frac{٥}{١٠}$ ● $\frac{٤}{٨}$

## زاراوەکان

شێوەی سادە

## فێربە

لەو کاتەی کەرتەکان کۆدەکرێتەوە، دەتوانی سەرجەم بنووسی بە سادەترین شێوە. دەڵێی کەرتەکە بە «**شێوەیەکی سادەیە**» کاتێ درێژترین شریتی کەرتەکان بەکاردێنیت بۆ نواندنی.

کارزان و رزگار کۆلێرەیەکیان بەشکرد بۆ نانی بەیانی. کۆلێرەکەیان کردە ٨ پارچەی یەکسان. کارزان دوو پارچەی خوارد و رزگار دوو پارچەی خوارد. کەرتی کۆلێرەکە چەندە کە دوو براکە خواردوویانە؟



$\frac{٢}{٨}$ + $\frac{٢}{٨}$ = ؟

سەرجەمی $\frac{٢}{٨} + \frac{٢}{٨}$ بە سادەترین شێوە بنووسە.

## چالاکی

**کەرەستەکان:** شریتی کەرتەکان

**هەنگاوی ١**

شریتی کەرتەکان بەکاربێنە بۆ نواندنی $\frac{٢}{٨}$.



$\frac{٢}{٨}$

**هەنگاوی ٢**

$\frac{٢}{٨}$ زیاد بکە.



$\frac{٢}{٨} + \frac{٢}{٨} = \frac{٤}{٨}$

**هەنگاوی ٣**

ئەو شریتە درێژە چییە هەمان درێژی هەیە؟



$\frac{٢}{٨} + \frac{٢}{٨} = \frac{٤}{٨} = \frac{١}{٢}$

$\frac{١}{٢}$ شێوەی سادەی کەرتی $\frac{٤}{٨}$.

کەواتە، دوو برایەکە $\frac{١}{٢}$ی کولێرەکەیان خواردووە.

- چۆن دەزانی کەوا کەرتێك بە سادەترین شێوەیە؟

## کۆکردنەوەی کەرتەکان

ئەگەر هاتوو کارزان دوو پارچەی زیادی خوارد لە کولێرەکە. ئەوا کەرتی کولێرەکە دوو برایەکە خواردوویانە دەبێتە چەند؟

شریتی کەرتەکان بەکاربێنە بۆ نووسینی سەرجەمی $\frac{٤}{٨} + \frac{٢}{٨}$ بە سادەترین شێوە.





$\frac{٤}{٨} + \frac{٢}{٨} = \frac{٦}{٨}$ یان $\frac{٣}{٤}$

کەواتە، برایەکان تا ئێستا $\frac{٣}{٤}$ی کولێرەکەیان خواردووە.

- چۆن دەزانی $\frac{٦}{٨} = \frac{٣}{٤}$ ؟
- ئایا کەرتی $\frac{٣}{٤}$ بە سادەترین شێوەیە؟

**لەبیرمەکە** دەتوانیت شریتی کەرتەکان بەکاربێنی بۆ کۆکرنەوەی کەرتەکان، یان نووسینیان بە سادەترین شێوە؟

### ساغبکەوە

١ ڕوونیبکەوە چۆن شریتی کەرتەکان بەکاردێنی بۆ هەژمارکردنی $\frac{٣}{١٢} + \frac{١}{١٢}$ و نووسینیان بە سادەترین شێوە؟

**کۆبکەوە پاشان سەرجەم بە سادەترین شێوە بنووسە.**

٢ 

$\frac{١}{٤} + \frac{١}{٤} = \square$ یان $\square$

٣ 

$\frac{٢}{٦} + \frac{٢}{٦} = \square$ یان $\square$

٤ 

$\frac{٢}{١٠} + \frac{٣}{١٠} = \square$ یان $\square$

### ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

**کۆبکەوە پاشان سەرجەم بە سادەترین شێوە بنووسە.**

٥ 

$\frac{٤}{١٢} + \frac{٢}{١٢} = \square$ یان $\square$

٦ 

$\frac{١}{٨} + \frac{١}{٨} = \square$ یان $\square$

**٧** **ڕێنوێنی** دایکی سەیران پارچە حەڵوایەکی کردە ١٢ پارچەی یەکسان. ئەندامانی خێزان ٤ پارچەیان خوارد. ئەو کەرتەی کە بەشە ماوەکە دەنوێنێ بە سادەترین شێوە بنووسە.

**٨** دوو منداڵ لە گەشتێك $\frac{٢}{٤}$ی گەشتەکەیان پێش نیوەڕۆ بڕی و $\frac{١}{٤}$ پاش نیوەڕۆ. کەرتی گەشتە بڕاوەکە چەندە؟

## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**٩** کام لەمانەی خوارەوە وەڵامی هەڵەیە؟ $\frac{٥}{١٦} + \frac{٣}{١٦} = \square$

أ $\frac{٨}{١٦}$ ب $\frac{٢}{١٦}$ ج $\frac{٤}{٨}$ د $\frac{١}{٢}$

## شیکارکردنی پرسیارەکان



## گۆشەی ڕووناکبیران

**مەتەڵ** کەعبەی پیرۆز دەکەوێتە کام شار؟
سەرجەم بدۆزەوە و پاشان بە سادەترین شێوە لە بەشی خوارەوەدا بنووسە بۆ ئەوە کەرتە بگەڕێ کە بەدەستی دێنیت و لەسەرەوەی پیتی گونجاو بنووسە.



| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{٣}{٩} + \frac{١}{٩}$ | ه | $\frac{١}{٨} + \frac{١}{٨}$ | ر | $\frac{٥}{١٢} + \frac{٦}{١٢}$ | ی | $\frac{٢}{٦} + \frac{٢}{٦}$ | ۆ | $\frac{٣}{٨} + \frac{٣}{٨}$ | ك |
| $\frac{٢}{٥} + \frac{٢}{٥}$ | م | $\frac{٥}{٨} + \frac{٢}{٨}$ | پ | $\frac{٢}{٩} + \frac{٢}{٩}$ | ه | $\frac{١}{١٠} + \frac{٢}{١٠}$ | ز | $\frac{٤}{١٢} + \frac{٧}{١٢}$ | ی |

؟ $\frac{٤}{٥}$ ؟ $\frac{٤}{٩}$ ؟ $\frac{٣}{٤}$ ؟ $\frac{٤}{٩}$ ؟ $\frac{١١}{١٢}$

؟ $\frac{٧}{٨}$ ؟ $\frac{١١}{١٢}$ ؟ $\frac{١}{٤}$ ؟ $\frac{٢}{٣}$ ؟ $\frac{٣}{١٠}$

وانەی ٨

# لێدەرکردنی کەرتەکان



## پێداچوونەوەی خێرا

کۆبکەوە سەرجەم بنووسە بە سادەترین شێوە.

١ $\frac{٣}{١٢} + \frac{١}{١٢} =$ ■   ٢ $\frac{١}{٤} + \frac{٢}{٤} =$ ■

٣ $\frac{٥}{٨} + \frac{١}{٨} =$ ■   ٤ $\frac{٣}{١٠} + \frac{٦}{١٠} =$ ■

## فێربە

نەسرین و پێشڕەو بەشداریانکرد لە پاکەتێك كێك کە ١٠ کێکی تێدایە نەسرین ٥ کێکی خوارد یان $\frac{٥}{١٠}$ی پاکەتەکە و پێشڕەو ٣ کێکی خوارد یان $\frac{٣}{١٠}$ی پاکەتەکە. ئەو کەرتە زیادەی نەسرین خواردویەتی لە چاو پێشڕەو بدۆزەوە.

هەموو کێکەکان



ئەو کێکانەی نەسرین خواردویەتی



ئەو کێکانەی پێشڕەو خواردویەتی





## چالاکی

شریتی کەرتەکان بەکاربێنە بۆ هەژمارکردنی $\frac{٥}{١٠} - \frac{٣}{١٠}$، پاشان بە سادەترین شێوە بنووسە.

**کەرەستەکان:** شریتی کەرتەکان.

**هەنگاوی ١**

شریتی کەرتەکان بەکاربێنە بۆ نواندنی $\frac{٥}{١٠}$ ، $\frac{٣}{١٠}$.





**هەنگاوی ٢**

هەردوو شریتەکە بەراوردبکە بۆ دۆزینەوەی جیاوازی.







**هەنگاوی ٣**

بگەڕێ بەدوای ئەو شریتەی هەمان درێژی هەیە.

سادەترین شێوەی کەرتی $\frac{٢}{١٠}$ بریتیەلە $\frac{١}{٥}$

$\frac{٥}{١٠} - \frac{٣}{١٠} = \frac{٢}{١٠}$ یان $\frac{١}{٥}$

کەواتە، نەسرین $\frac{١}{٥}$ی پاکەتەکەی زیاتر خواردووە لە پێشڕەو.

- ئەو کەرتەی کە خواردنی هەردوو هاوڕێیەکان دەنوێننێ چەندە؟ ئەو کەرتەی کە ماوەکە دەنوێنێ چەندە؟

## لێدەرکردنی کەرتەکان

وا دابنێ ژمارەی کێکەکان لە پاکەتەکەدا ٨ بوون، دوو برادەرەکە بەیەکەوە ٤ کێکیان خوارد.
ئەو کەرتە کامەیە کە خواردنی هەردووکیان پێکەوە دیاردەکات؟
ئەو کەرتە کامەیە کە ماوەکە دەنوێنێ؟

شریتی کەرتەکان بەکاربێنە بۆ دۆزینەوەی $\frac{٨}{٨} - \frac{٤}{٨}$، لە پاشان جیاوازییەکە بە سادەترین شێوە بنووسە.

$\frac{٨}{٨}$ = ئەم کەرتە ژمارەی هەموو کێکەکان دەنوێنێ.

$\frac{٤}{٨}$ = ئەو کەرتە ژمارەی کێکەکانی کە هەردوو برادەرەکە خواردویانە دەنوێنێ.

$\frac{٤}{٨}$ = ئەو کەرتە ژمارەی ئەو کێکانە دەنوێنێ کە ماونەتەوە.

سادەترین شێوەی کەرتی $\frac{٤}{٨}$ بریتییە لە $\frac{١}{٢}$.

$\frac{٨}{٨} - \frac{٤}{٨} = \frac{٤}{٨}$ یان $\frac{١}{٢}$

کەواتە، $\frac{١}{٢}$ی کێکەکان ماوەتەوە.

**لەبیرمەکە** دەتوانی شریتی کەرتەکان بەکاربێنی بۆ لێدەرکردنی کەرتەکان یان بۆ نووسینیان بەسادەترین شێوە.

## ساغبکەوە

١ ڕوونیبکەوە چون شریتی کەرتەکان بەکاردێنیت بۆ دۆزینەوەی $\frac{٣}{٤} - \frac{١}{٤}$، و نووسینی جیاوازییەکان بە سادەترین شێوە.

٢ $\frac{٥}{٦} - \frac{٢}{٦} = ■$

٣ $\frac{٦}{١٢} - \frac{٢}{١٢} = ■$

٤ $\frac{٨}{١٠} - \frac{٣}{١٠} = ■$

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

**بەراورد بکە. جیاوازی بدۆزەوە، لە پاشان بە سادەترین شێوە بنووسە.**

٥ $\frac{٤}{٦} - \frac{١}{٦} = ■$

٦ $\frac{٦}{١٢} - \frac{٣}{١٢} = ■$

٧ $\frac{٣}{٨} - \frac{٢}{٨} = ■$

٨ $\frac{٤}{٥} - \frac{٢}{٥} = ■$

٩ $\frac{٦}{٨} - \frac{٤}{٨} = ■$

١٠ $\frac{٥}{٦} - \frac{٣}{٦} = ■$

**جیاوازی چەندە؟ وەڵامەکە بە سادەترین شێوە بنووسە. شریتی کەرتەکان بەکاربێنە.**

**١١** $\frac{٢}{٣} - \frac{١}{٣} = ▢$   **١٢** $\frac{٤}{٦} - \frac{٢}{٦} = ▢$   **١٣** $\frac{٥}{٦} - \frac{١}{٦} = ▢$

**١٤** **هەڵە لە کوێیە؟** لاڤین نووسی $\frac{٥}{١٢} - \frac{٣}{١٢} = ٢$. هەڵەی لاڤین لە کوێیە؟

**١٥** **دەرئەنجام** چنار سێوێکی بەیەکسانی پارچە پارچە کرد. ٣ پارچەی خوارد و ٦ پارچەی ماوە. ئەو کەرتە سێوەی چنار خواردوویەتی چەند دەنوێنێ؟

## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٦** سازان $\frac{٢}{٧}$ی کتێبی چیرۆکەکەی خوێند. چەندی ماوە لە کتێبەکە بخوێنێت؟

أ $\frac{٢}{٧}$   ب $\frac{٥}{٧}$   ج $\frac{٤}{٧}$   د $\frac{٧}{٢}$

## شیکارکردنی پرسیارەکان



## گۆشەی رووناکبیران

**پەیوەست بە جوگرافیا** ئەوەی دیزانیت لە کۆکردنەوەی کەرتەکان و لێدەرکردنیان بەکاربێنە بۆ دۆزینەوەی دوورییەکان لەسەر نەخشە. ئەگەر پێوەری نەخشەکامان زانی، کەواتە دەتوانین پێوانەی دوورییەکان بزانین. هەریەکەیەکی پێوانە لەسەر نەخشەی بەرامبەر $\frac{١}{١٠}$ کیلۆمەتر دەنوێنێ.

لەیلا حەزدەکات سەردانی دلبەری برادەری بکات لە ماڵەوە لەپاش دەرچوونی لە قوتابخانە. نەخشە بەکاربێنە بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانەی خوارەوە:




أ دووری نێوان ماڵی دلبەر و قوتابخانەکەی چەندی زیاترە لە دووری نێوان ماڵی و فرۆشگاکەی؟

ب ماڵی لەیلا چەند دوورە لە قوتابخانە؟

ج کامیان دوورترە لە قوتابخانە ماڵی دلبەر یان ماڵی لەیلا؟

د **ڕێنوێنی** دلبەر گوتی فرۆشگایەکە $\frac{١}{٢}$ کم دوورە لە ماڵمان. ئایا لەگەڵ ئەم بۆچوونەی ڕوونبیکەوە.

# بەشی ٨

# پێداچوونەوە

## دڵنیابوون لە زاراوەکان

دەربڕینی گونجاو لە لیستی بەرامبەر هەڵبژێرە.

کەرت
سەرە
ژێرە
ژمارەی دەیی

**١** ژمارەی ٣ لە کەرتی $\frac{٣}{٨}$ پێدەگوترێت ___؟___ .

**٢** ___؟___ بەکاردێنین بۆ دیاریکردنی بەشێك.

**٣** ٠,٣ بریتییە لە ___؟___ کە کەرتی $\frac{٣}{١٠}$ دیاردەکات.

ئەم کەرتانە بە شێوەی ژمارەی دەیی بنووسە.

**٤** $\frac{٤}{١٠}$ **٥** $\frac{٩}{١٠}$ **٦** $\frac{٢}{١٠}$ **٧** $\frac{٧}{١٠}$ **٨** $\frac{١}{١٠}$ **٩** $\frac{١٠}{١٠}$

## دڵنیابوون لە کارامەییەکان

شریتی کەرتەکان بەکاربێنە بۆ دۆزینەوەی کەرتی هاوتا بۆ هەر کەرتێك.

**١٠** $\frac{٦}{٤}$ **١١** $\frac{٨}{١٠}$ **١٢** $\frac{٣}{٦}$

ئەو کەرتە بنووسە کە پارچە ڕەنگکراوەکە دیاردەکات پاشان بە شێوەی پیتی بنووسە.

**١٣** 
**١٤** 
**١٥** 
**١٦** 

هێڵی ژمارەکان بەکاربێنە بۆ ڕیزکردنی ژمارە دەییەکان بەرەو ژوور

**١٧** ٠,٩ ٠,٣ ٠,٤ **١٨** ٠,١ ٠,٨ ٠,٧




ئەو کەرتە بنووسە کە بەشە ڕەنگکراوەکە دیاردەکات پاشان بە شێوەی ژمارەی دەیی بنووسە.

**١٩** 
**٢٠** 
**٢١** 
**٢٢** 

## دڵنیابوون لە شیکاری پرسیارەکان

**٢٣** شێروان $\frac{١}{٢}$ کم ڕۆیشت، شێرکۆ $\frac{٤}{٥}$ کم ڕۆیشت، سمکۆ $\frac{١}{٣}$ کم ڕۆیشت، ئایا کام لە هەرسێکیان درێژترین دووری ڕۆیشتووە؟

**٢٤** دونیا ٣ پێنووسی زەرد و ٤ پێنووسی شین و ٣ پێنووسی سووری هەیە، کام کەرت پێنووسە سوورەکان دەنوێنێ؟

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**ئاگاداربە!**

- هەموو ناوەڕۆکەکە بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت لە پرسیارەکە.
- وەڵامەکانت ساغبکەوە.

**وەڵامی گونجاو دەوربدە لە ڕاهێنانەکانی ١ تا ١٠.**

**١** کام هێما وا دەکا کە بەراوردەکە ڕاستبێت؟

$\frac{١}{٢}$ ◻ $\frac{٢}{٣}$



أ $<$    ب $=$    ج $>$    د $\times$

**٢** کام کۆمەڵەی ئەم کەرتانە بەرەو ژوور ڕیزکراون؟



أ $\frac{٥}{٦}$ ، $\frac{١}{٢}$ ، $\frac{٢}{٣}$

ب $\frac{١}{٢}$ ، $\frac{٢}{٣}$ ، $\frac{٥}{٦}$

ج $\frac{١}{٢}$ ، $\frac{٥}{٦}$ ، $\frac{٢}{٣}$

د $\frac{٢}{٣}$ ، $\frac{١}{٢}$ ، $\frac{٥}{٦}$

**٣** کام ژمارەی دەیی بەشە ڕەنگکراوەکە دەنوێنێ؟



أ ٠,٥

ب ٠,٦

ج ٠,٧

د ٦,٠

**٤** کام خاڵ ٠,٥ دیاردەکات؟




أ س    ب ع    ج ف    د ق

**٥** $\frac{٧}{١٠} + \frac{٢}{١٠} =$ ◻

أ $\frac{٩}{٢٠}$    ج $\frac{٩}{١٠}$

ب $\frac{٥}{٢٠}$    د $\frac{٥}{١٠}$

**٦** بە ئاراس و برادەرەکەی لە $\frac{٦}{٨}$ی پیتزایەك بەشداربوون، $\frac{٣}{٨}$ پیتزاکەیان پێکەوە خوارد. ئەو کەرتە چییە کە لە پیتزاکە ماوەتەوە؟

أ $\frac{٢}{٦}$    ب $\frac{٩}{٨}$    ج $\frac{٣}{٨}$    د $\frac{٣}{٤}$

**٧** $\frac{٢}{٦} + \frac{٣}{٦} =$ ◻

أ $\frac{٥}{٦}$    ج $\frac{٥}{١٢}$

ب $\frac{٢}{٦}$    د ١

**٨** ٧ × (٢ × ٤) = ◻

أ ١٣    ج ٥٦

ب ١٤    د ئەوانی تر

**٩** $\frac{٦}{٨} - \frac{٢}{٨} =$ ◻

أ $\frac{١}{٦}$    ج $\frac{٢}{٣}$

ب $\frac{١}{٢}$    د $\frac{٨}{٦}$

**١٠** قوتابیانی پۆلی سێیەم ویستیان درێژی هۆڵی ئاهەنگەکان لە قوتابخانە بپێون کام یەکەی پێوان گونجاوە؟

أ کووپ    ج کیلۆمەتر

ب کیلۆگرام    د مەتر

## ئەوەی دەیزانی بینووسە

**١١** مانای دوو کەرتی هاوتا چییە؟

**١٢** شریتی کەرتەکان بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی سەرەی نادیار.



$\frac{١}{٣} = \frac{◻}{٦}$

بەشی ٩

# لێکدان و دابەشکردنی ژمارەیەکی یەك ڕەنووسی لە ژمارەیەکی یەك ڕەنووسی یان دوو ڕەنووسی

کۆمپانیاکانی فڕۆکەوانی توشی چەندەها کێشە دەبن. لەو کێشانە دەستنیشانکردنی ژمارەی گەشتە ئاسمانییەکان و جۆریفڕۆکەکانە.

**شیکارکردنی پرسیارەکان** سەیری خشتەکە بکە. ئایا کۆمپانیا دەتوانێت زۆرترین گەشتیار بگوازێتەوە بە ٤ فڕۆکە لە جۆری بۆینگ ٧٥٧ یان ٥ فڕۆکەی جۆری بۆینگ ٧٢٧؟

**فڕۆکەکان و گەشتیارەکان**

| جۆر | ژمارەی گەشتیاران |
|---|---|
| ٧٢٧ | ١٤٩ |
| ٧٣٧ | ١١٩ |
| ٧٥٧ | ١٩٠ |
| ٧٦٧ | ٢٥٤ |

# زانیارییەکانت ساغبکەوە



ئەم لاپەڕیە بەکاربهێنە بۆ دڵنیابون لە هەبوونی
ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە لەم بەشە

## ڕاستییەکانی لێکدان

لێکبدە.

١ ٦ × ٧ = ▢

٢ ▢ = ٣ × ٤

٣ ٧ × ٨ = ▢

٤ ٥ × ٩ = ▢

٥ ٥ × ٧ ___

٦ ٤ × ٩ ___

تەواوبکە.

٧ ٤ × ▢ = ١٢

٨ ▢ × ٥ = ٢٠

٩ ٩ × ▢ = ٨١

١٠ ٣ × ٩ = ▢

١١ ▢ × ٨ = ١٦

١٢ ٨ × ▢ = ٤٠

## ڕاستییەکانی لێکدان و دابەشکردن

لێکبدە یان دابەشبکە.

١٣ ٦ × ٦ = ▢

١٤ ٣٠ ÷ ٦ = ▢

١٥ ١٢ × ٣ = ▢

١٦ ٨ × ٨ = ▢

١٧ ٨١ ÷ ٩ = ▢

١٨ ▢ = ٩ × ٩

١٩ ٨⟌٥٦

٢٠ ٦⟌٥٤

## خڕکردنەوە و خوردکردنەوە

ژمارەی نادیار بنووسە.

٢١ ١٨ دەیی و ٧ سەدی = ٨ دەیی و ▢ سەدی

٢٢ ٢٣ دەیی و ٥ سەدی = ▢ دەیی و ٧ سەدی

٢٣ ▢ دەیی و یەك سەدی = ٣ دەیی و دوو سەدی

وانەی ١

بەدەستی

# لێکدان لە ژمارەیەکی دوو ڕەنووسی



## پێداچوونەوەی خێرا

١ ٦ × ٥ = ▢

٢ ▢ = ٤ × ٣

٣ ١٠ × ٦ = ▢

٤ ▢ = ٦ × ٨

## کەرستەکان

یەکان و شریتەکانی دەیی

## فێربە

مامۆستا داوای لە قوتابیانی بەشداربووی پێشبرکێیەکان کرد کە لە ٤ ڕیز بووەستن. ژمارەی قوتابیانی هەر ڕیزێکی ژمارد، بینی لەهەر ڕیزێك ١٦ قوتابی هەیە. ژمارەی قوتابیە بەشداربووەکانی پێشبرکێیەکە چەندە؟

### چالاکی

ڕیزکراوێك دروستبکە پرسیارەکە بنوێنێ بەبەکارهێنانی پارچە دەییەکان.

**هەنگاوی ١**

هەر ڕیزێك ژمارە ١٦ دەنوێنێ بە هۆی ٦ یەکان و شریتێکی دەیی.

٤ ڕیز دروستبکە بۆ ئەوەی ٤ × ١٦ بنوێنێ.



**هەنگاوی ٢**

یەکان و دەیان کۆبکەرەوە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان.



٤ × ٦ = ٢٤ ٤ × ١٠ = ٤٠

٢٤ + ٤٠ = ٦٤

کەواتە، ژمارەی قوتابییە بەشداربووەکان ٦٤.

**بەبیرتبێنەوە**

ڕیزکراوەیەك شتە بەشکراوەکان لە هەر ڕیزو ستوونێك دیاردەکات.

ڕیزکراوێکی لە ٣ ڕیز و ٥ ستوون ٣ × ٥ دیاردەکات.






- چۆن یەکان و دەیان کۆکردەوە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان؟
- **ڕێنوێنی** بۆچی شریتی دەیی و ٦ یەکان زیاتر یارمەتیت دەدات لە کاتی نواندنی ژمارە ١٦ لە نواندنی بە ١٦ یەکان؟

### هەوڵبدە

یەکان و شریتەکانی دەیی بەکاربێنە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان.

أ ٤ × ١٣ = ▢ ب ٣ × ١٨ = ▢

## ببەستەوە

دەتوانی ڕیزکراوەکان بەکاربێنی لەسەر پەڕەی چوارگۆشەکان بۆ لێکدانی ژمارەیەکی یەك ڕەنووسی لە ژمارەیەکی دوو ڕەنووسی.

هەژماربکە: ٣ × ١٧ .




٣ ڕیز لە ٧      ٣ ڕیز لە ١٠

٣ × ٧ = ٢١      ٣ × ١٠ = ٣٠

٢١ + ٣٠ = ٥١

کەواتە، ٣ × ١٧ = ٥١ .

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

**ڕیزکراوەکان بەکاربێنە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان.**

**١**



٢ × ٩ = ١٨      ٢ × ١٠ = ٢٠

٢ × ١٩ = ▢

**٢**



٣ × ٤ = ١٢      ٣ × ١٠ = ٣٠

٣ × ١٤ = ▢

**یەکان و شریتی دەیی بەکاربهێنە، یان پەڕەی چوارگۆشەکان، بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان.**

**٣** ٦ × ١٤ = ▢      **٤** ٥ × ١٣ = ▢      **٥** ٦ × ١٦ = ▢

**٦** **ڕێنوێنی** ڕیزکراوەیەك بکێشە لەسەر پەڕەی چوارگۆشەکان بۆ دۆزینەوەی ژمارەی نادیار لە ▢ × ١٨ = ٧٢.

**٧** **بنووسە** چۆن ٣ × ٢١ دەنوێنی؟ چۆن ئەنجامی لێکدان دەدۆزیتەوە؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**٨** ٤٥ × ٦ = ؟

أ ٥١      ب ٢٧٠      ج ٢٢٠      د ١٥

وانەی ٢

# تۆمارکردنی کرداری لێکدان



## پێداچوونەوەی خێرا

١. ٢ × ٤ = ■

٢. ٥ × ٧ = ■

٣. ■ = ٢ × ١٠

٤. ■ = ٨ × ٣

### فێربە

**لەناودڵ** بەرجەستەی دڵێکی دانراو لە مۆزەخانەیەکی زانستی لە ٤ بەش پێکهاتووە. لەهەر بەشێك لە بەشەکانی ٣٠ کورسی هەیە. چەند میوان دەتوانن لەناو ئەو دڵە دانیشن؟



### نموونە ١

٤ × ٣٠ = ■ یان

$$\begin{array}{r} ٣٠ \\ \times\ ٤ \\ \hline \end{array}$$

شریتەکانی دەیی بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان.

**هەنگاوی ١**

دەستبکە بە نواندنی ٤ کۆمەڵە لە ٣٠.



**هەنگاوی ٢**

پاشان. دەیان خربکەوە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان.
لەکۆتاییدا، ١٠ دەیی خربکەوە لەسەد، ١٠٠ و دوو دەییت دەستدەکەوێت.



• چ کردارێکی کۆکردنەوە وەڵامی ٤ × ٣٠ دەداتەوە؟

### نموونە

أ) ٣ × ٢٠ = ٦٠

ب) ٢ × ٤٠ = ٨٠

ج)

$$\begin{array}{r} ٥٠ \\ \times\ ٢ \\ \hline ١٠٠ \end{array}$$

• چ کردارێکی کۆکردنەوە وەڵامی ٢ × ٥٠ دەداتەوە؟

## نموونە ٢

٥ پاس هاتن بۆ گواستنەوەی قوتابیان بۆ یاریگای تۆپی پێ. هەر پاسێك ٢٣ قوتابی گواستەوە. ژمارەی هەموو قوتابیان چەندە؟

**هەنگاوی ١**

دەستبکە بە نواندنی ٥ کۆمەڵە لە ٢٣ پاشان یەکان لێکبدە.

| دەیان | یەکان |
|---|---|
| ٢ | ٣ |
| | ٥ × |
| ١ | ٥ |

(٥ × ٣ یەکان)

**هەنگاوی ٢**

پاشان، دەیان لێکبدە.

| سەدان | دەیان | یەکان |
|---|---|---|
| | ٢ | ٣ |
| | | ٥ × |
| | ١ | ٥ |
| ١ | ٠ | ٠ |

(٥ × ٢ دەیان)

**هەنگاوی ٣**

خربکەوە تا ئەنجامت دەستدەکەوێت.

| سەدان | دەیان | یەکان |
|---|---|---|
| | ٢ | ٣ |
| | | ٥ × |
| | ١ | ٥ |
| ١ | ٠ | ٠ + |
| ١ | ١ | ٥ |

کەواتە، ژمارەی قوتابیان بریتییە لە ١١٥.

- زانینی بەهای ٥ × ٢ چۆن یارمەتیت دەدات بۆ ئەنجامدانی ٥ × ٢٠.

## ساغبکەوە

**١** یەکان و شریتی دەیی بەکاربێنە بۆ نواندنی ٥ × ٢٨. کاغەز و پێنووس بەکاربێنە بۆ تۆمارکردنی ئەوەی ئەنجامتدا.

لێکبدە.

**٢** ٣٠ × ٢

**٣** ٢٤ × ٣

**٤** ٣٨ × ٢

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

لێکبدە.

**٥** ٢٠ × ٤

**٦** ٢٢ × ٤

**٧** ٦٧ × ٢

جەبر یەکان و شریتەکانی دەیی بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی ژمارەی نادیار.

**٨** ٦ × ▢ = ١٣٢

**٩** ٤ × ▢ = ٥٦

**١٠** ▢ × ٢١ = ٦٣

**١١** ▢ × ٢٥ = ١٠٠

**١٢** ڕۆژ ٢٤ کاتژمێرە. و هەفتە ٧ ڕۆژە، چەند کاتژمێر لە هەفتەیەکدا هەیە؟

**١٣** **ڕێنوێنی** کرمانج وتی ٥ × ١٨ دەکاتە ٤٠ + ٥٠ ئایا لەگەڵ بۆچوونی ئەوی؟ ڕوونیبکەوە.

## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٤** نسرین ٤ قوتوو پێنووسی پێیە لە هەر قوتوویەك ١٠ پێنووس هەیە، چۆن کرداری لێکدان تۆمار دەکەیت بۆ دۆزینەوەی ژمارەی پێنووسەکان؟

أ ٤ × ١٠ =　　　ج ٤ + ١٠ =

ب ١٠ × ٤ =　　　د ١٠ + ١٠ + ١٠ + ١٠

## شیکارکردنی پرسیارەکان



## مێژووی بیرکاری

ئەورووپییەکان تۆڕیان بەکاردەهێنا بۆ ئەنجامدانی لێکدان لە هەردوو سەدەی چواردەمین و پانزەمین، ڕاستییەکانی لێکدانی بنەڕەتی و تۆڕێك بەکاردێنن بۆ ئەنجامدانی کرداری ٧ × ٤٦٥.



- ریزێکی ٣ چوارگۆشەیی دەکێشین و تیرەی هەر چوارگۆشەیەك دەکێشین. دوو ژمارەکە دەنووسین وەك لە بەرامبەردا دیارکراوە.




- ٧ لەهەر ڕەنووسێك لە ڕەنووسەکانی ژمارەی دووەم دەدەین.
  ٧ × ٥ = ٣٥
  ٧ × ٦ = ٤٢
  ٧ × ٤ = ٢٨




- ئەنجامەکان دەنووسین، وەك ڕوونکراوەتەوە لە بەرامبەر.
- لە ڕاستەوە دەستپێدەکەین، ڕەنووسەکان کۆدەکەینەوە بە پێی هەر تیرەیەك و لەکاتی پێویستدا دەیان کۆدەکەینەوە.

کەواتە، ٧ × ٤٦٥ = ٣٢٥٥




ڕێگەی پێشوو بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان.

أ ٦ × ٧٢٢ =　　ب ٨ × ٣٤٦ =　　ج ٤ × ٢٩٦ =　　د ٣ × ٤٣٥ =

وانەی ٣

# لێکدان لە ١٠ و لە ١٠٠ و لە ١٠٠٠



**پێداچوونەوەی خێرا**

١) ٦ × ٤ = ▢

٢) ٢ × ٧ = ▢

٣) ٧ × ٨ = ▢

٤) ٣ × ٨ = ▢

## فێربە

٣ × ١ = ٣ ‏ ‏ ‏ ‏ ٥ × ١ = ٥

٣ × ١٠ = ٣٠ ‏ ‏ ‏ ‏ ٥ × ١٠ = ٥٠

٣ × ١٠٠ = ٣٠٠ ‏ ‏ ‏ ‏ ٥ × ١٠٠ = ٥٠٠

٣ × ١٠٠٠ = ٣٠٠٠ ‏ ‏ ‏ ‏ ٥ × ١٠٠٠ = ٥٠٠٠

بڕوانە ئەنجامی لێکدان بریتییە لە ژمارەی لێکدراوەکە بە زیادکردنی سفرێك بۆ لای ڕاستی ژمارە لێکدراوەکە ئەگەر لێکدان لە ١٠ بێت. وە دوو سفر ئەگەر لێکدان لە ١٠٠ بێت. وە سێ سفر ئەگەر لێکدان لە ١٠٠٠ بێت.



**لەبیرمەکە** دەتوانیت خشتەی خانەکان بەکاربێنیت بۆ یارمەتیدانت لە لێکدان لە ١٠ و لە ١٠٠ و لە ١٠٠٠.

| | یەکان | دەیان | سەدان | هەزاران |
|---|---|---|---|---|
| ٢ × ٤ = ٢ × ٤ یەکان | ٨ | | | |
| ٢ × ٤٠ = ٢ × ٤ دەیان | ٠ | ٨ | | |
| ٢ × ٤٠٠ = ٢ × ٤ سەدان | ٠ | ٠ | ٨ | |
| ٢ × ٤٠٠٠ = ٢ × ٤هەزاران | ٠ | ٠ | ٠ | ٨ |

## نموونە

| أ | ب | ج |
|---|---|---|
| ٤ × ١ = ٤ | ٣ × ٢ = ٦ | ٢ × ٥ = ١٠ |
| ٤ × ١٠ = ٤٠ | ٣ × ٢٠ = ٦٠ | ٢ × ٥٠ = ١٠٠ |
| ٤ × ١٠٠ = ٤٠٠ | ٣ × ٢٠٠ = ٦٠٠ | ٢ × ٥٠٠ = ١٠٠٠ |
| ٤ × ١٠٠٠ = ٤٠٠٠ | ٣ × ٢٠٠٠ = ٦٠٠٠ | ٢ × ٥٠٠٠ = ١٠٠٠٠ |

- بۆچی سفرەکانی نموونەی (ج) پترن لەوانەی نموونە (أ) و (ب)؟

## ساغبکەوە

**١** ڕوونیبکەوە چۆن ڕاستییەکانی لێکدانی ٦ × ٤ = ٢٤ بەکاردێنیت بۆ ئەنجامدانی ٦ × ٤٠؟

تەواوبکە.

**٢**
٦ × ١ = ▢
٦ × ١٠ = ▢
٦ × ١٠٠ = ▢
٦ × ١ ٠٠٠ = ▢

**٣**
٤ × ٥ = ▢
٤ × ٥٠ = ▢
٤ × ٥٠٠ = ▢
٤ × ٥ ٠٠٠ = ▢

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

تەواوبکە.

**٤**
٥ × ١ = ▢
٥ × ١٠ = ▢
٥ × ١٠٠ = ▢
٥ × ١ ٠٠٠ = ▢

**٥**
١٠ × ١ = ▢
▢ × ١٠ = ١٠٠
١٠ × ١٠٠ = ▢
١٠ × ▢ = ١٠ ٠٠٠

ژمارەی نادیار چییە؟

**٦** ٢ × ٧٠ = ▢

**٧** ▢ = ٦ × ٤٠٠

**٨** ▢ = ٥ × ٣٠٠

**٩** ٥ × ٤ ٠٠٠ = ▢

**١٠** **ڕێنوێنی** ئەو ڕاستییەی لێکدان چییە کە دەتوانیت بەکاریبێنی بۆ ئەنجامدانی ٥ × ٦٠٠؟ ڕوونیبکەوە.

**١١** **پرسیار چییە؟** سندوقی بزمارەکان ٨٠ پاکەتی تێدایە. وەڵام ٤٨٠ پاکەت؟



### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٢** درێژی ژوورەکە ٣ مەترە. درێژی ژوورەکە چەند سانتیمەترە؟

أ ٣سم ب ٣٠سم ج ٣٠٠ سم د ٣٠٠٠ سم



**پێداچوونەوەی خێرا**

١) ٣٢ × ٢  
٢) ٥٣ × ٦  
٣) ٣٦ × ٤  
٤) ٢٤ × ٧

وانەی ٤

# ڕاهێنان لەسەر لێکدان

## فێربە

**لەناو فڕۆکە** فڕۆکەیەکی کۆمپانیای زاگرۆس لە ڕۆژێکدا دوو گەشت ئەنجامدەدات لە نێوان بەیروت و هەولێر. هەر فڕۆکەیەك ١٦٨ کەشتیار دەگوازێتەوە لەهەر گەشتێکدا. فڕۆکەکە چەند گەشتیار لەهەر ڕۆژێکدا دەگوازێتەوە؟

٢ × ١٦٨ = ▭ یان ١٦٨ × ٢

**بەکارهێنانی کاغەز و پێنووس** لەبەر ئەوەی لێکدانی یەکان پێویستی بە خرکردنەوە هەیە، بۆیە بەکارهێنانی کاغەز و پێنووس پێویستە.

**هەنگاوی ١**

یەکان لێکبدە. ٢ × ٨ یەکان = ١٦ یەکان.

١٦ یەکان بکە بە یەك دەیان و ٦ یەکان.

| سەدان | دەیان | یەکان |
|---|---|---|
| | ١ | |
| ١ | ٦ | ٨ |
| | | ٢ × |
| | | ٦ |

**هەنگاوی ٢**

دەیان لێکبدە. ٢ × ٦ دەیان = ١٢ دەیان.

لەگەڵ دەی دەستکەوتووی هەنگاوی یەکەم دەبێتە ١٣ دەیی.

١٢ دەیی + یەك دەیی = ١٣ دەیی

١٣ دەیی بکە بە یەك سەدی و ٣ دەیی.

| سەدان | دەیان | یەکان |
|---|---|---|
| ١ | ١ | |
| ١ | ٦ | ٨ |
| | | ٢ × |
| | ٣ | ٦ |

**هەنگاوی ٣**

سەدان لێکبدە. ٢ × ١ سەدی = ٢ سەدان.

لەگەڵ ئەو سەدەی دەست کەوتوو لە هەنگاوی ٢، دەبێتە ٣ سەدان.

٢ سەدان + یەك سەدان = ٣ سەدان.

| سەدان | دەیان | یەکان |
|---|---|---|
| ١ | ١ | |
| ١ | ٦ | ٨ |
| | | ٢ × |
| ٣ | ٣ | ٦ |



کەواتە، فڕۆکەکە ٣٣٦ گەشتیار لەهەر ڕۆژێکدا دەگوازێتەوە.

## بەکارهێنانی هەژمێرکردنی هزری

٧ × ٣١ = ؟

لەبەر ئەوەی لێکدانی یەکان پێویستی بە خوردکردنەوە نییە، لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی هەژمێرکردنی هزری گونجاوە. ٧ × ١ = ٧.

بیریکەوە: ٧ جار ٣ دەیان یان ٧ × ٣٠ = ٢١٠

کەواتە، ٧ × ٣١ = ٧ + ٢١٠ = ٢١٧

## لێکدانی ژمارەیەکی چوار ڕەنووسی لە ژمارەیەکی یەك ڕەنووسی

١ ٨٥٣ × ٢ = ▢ بدۆزەوە.

| هەنگاوی ١ | هەنگاوی ٢ | هەنگاوی ٣ | هەنگاوی ٤ |
|---|---|---|---|
| یەکان لێکبدە. | دەیان لێکبدە. | سەدان لێکبدە. | هەزاران لێکبدە. |
| ١ ٨٥٣ × ٢ = ٦ | (١) ١ ٨٥٣ × ٢ = ٠٦ | (١ ١) ١ ٨٥٣ × ٢ = ٧٠٦ | (١ ١) ١ ٨٥٣ × ٢ = ٣ ٧٠٦ |

کەواتە، ١ ٨٥٣ × ٢ = ٣ ٧٠٦ .



### نموونە

| أ | ب | ج |
|---|---|---|
| (١ ١) ١ ٦٢٥ × ٣ = ٤ ٨٧٥ | (٢ ٤ ١) ١ ٤٨٢ × ٥ = ٧ ٤١٠ | (٣ ٣) ٢ ٠٨٩ × ٤ = ٨ ٣٥٦ |

### ساغبکەوە

**١** ڕوونیبکەوە چۆن خڕکردنەوە بەکاردێنیت بۆ دۆزینەوەی ٥ × ٣٤؟ ئەنجامی لێکدان بدۆزەوە.

**٢** ڕوونیبکەوە لەبەر چی پێویستمان بە خڕکردنەوەی دەیان نەبوو لە نموونەی (أ)؟

ئەو ڕێگایەی بەکارت هێناوە بۆ لێکدان بلێ و ئەنجام بنووسە.

**٣** ١٢٤ × ٣

**٤** ٢٧٥ × ٤

**٥** ٤٦١ × ٥

**٦** ٥١٤ × ٢

## ▶ ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

ئەنجامی لێکدان چییە؟ ئایا پێویستی بە خڕکردنەوە هەیە؟

**٧**

| س | د | ی |
|---|---|---|
| | ١ | ٣ |
| | | ٣ × |
| | | |

**٨**

| س | د | ی |
|---|---|---|
| | ١ | ٤ |
| | | ٧ × |
| | | |

**٩**

| س | د | ی |
|---|---|---|
| | ٣ | ٤ |
| | | ٢ × |
| | | |

**١٠**

| س | د | ی |
|---|---|---|
| | ٣ | ١ |
| | | ٥ × |
| | | |

ئەنجامی لێکدان چییە؟

**١١** ١ ١٨٦ × ٨

**١٢** ٣ ٢٤٥ × ٣

**١٣** **ڕێنوێنی** چۆن دەزانی کە ئەنجامی لێکدانی ٤ × ٨٢ لە دوو ڕەنووسی گەورەتر دەبێت بێ ئەوەی ئەنجام بدۆزیتەوە؟

**١٤** ڕەنووسی نادیار چییە؟ چۆنت دۆزیەوە؟

٢١■٥ × ٤ = ٨ ٧٠٠

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٥** وەڵامی کرداری لێکدانی بەرامبەر کامەیە ٢٥٢ × ٩ ؟

أ ٢٣٦٨ ب ٢٢٦٨ ج ٢٢٥٨ د ٢٢٥٠

## شیکارکردنی پرسیارەکان — دەروازەیەك لەسەر هونەر

هونەرمەند جەواد سەلیم (١٩٢١ – ١٩٦١) بەناوبانگترین پەیکەرتاش لە مێژووی عیراقی نوێدا دادەنرێت. لە تەمەنی ١١ساڵیدا خەڵاتی زیوی بەدەستهێنا لە پەیکەر تاشیدا لە یەکەم پیشانگای هونەری لە بەغدا ساڵی ١٩٣١. بە نێراو (بعثە) ناردرا بۆ فەرەنسا بۆ خوێندنی پەیکەرتاشی لە پاریس ساڵی (١٩٣٨ – ١٩٣٩). هەروەها بۆ ڕۆما ساڵی (١٩٣٩ – ١٩٤٠) و پاشان بۆ لەندەن ساڵی (١٩٤٦ – ١٩٤٩). سەرۆکایەتی بەشی پەیکەرتاشی لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە بەغدا کردووە تا کۆچی دوایکرد لە ٢٣ کانوونی دووەمی ١٩٦١. یەکێك لە بەناوبانگترین کارەکانی پەیکەری ئازادی لە گۆڕەپانی تەحریر لە بەغدا کە دادەنرێت بە گرنگترین پەیکەری هونەری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. هەروەها پەیکەرەکەی (زیندانی ڕامیاری نادیار) (السجین السیاسی المجهول) خەڵاتی دووەمی وەرگرت لە پێشبرکێی پەیکەرتاشی جیهانی کە تەنها بەشداربوو بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە وڵاتە یەکگرتووەکان نموونەیەکی بچووکراوی برونزی ئەو بەیکەرەی پاراستووە لای خۆی. پاش کۆچکردنی بە چەند ساڵێك پیشانگایەکی بەرفراوانی بۆ کرا بۆ کارەکانی لە مۆزەخانەی نیشتمانی هونەری لە بەغدا.

پەیکەری ئازادی لە گۆڕەپانی تەحریر

أ ئەگەر دابنێین کە ٣٥ کەس لە سەعاتێك سەردانی پیشانگاکەی کردبێت، ژمارەی میوانەکانی پیشانگایەکە لە ٨ سەعات چەندبووە؟

ب قوتابیانی قوتابخانەیەك سەردانی پیشەنگاکەیان کرد، ٣ پاسیان دابینکردبۆ گواستنەوەی قوتابیان کە هەر پاسێك ٥٧ قوتابی بگواستەوە، ژمارەی ئەو قوتابییانە چەندە کە سەردانی ئەم پیشانگایەیان کرد؟

وانەی ٥

# کارامەیی لە شیکاری پرسیارەکان

## « هەڵبژاردنی کردارێك »



**پێداچوونەوەی خێرا**

١) $15 \times 6$

٢) $72 \times 8$

٣) $232 + 521$

٤) $495 - 208$

تێبگە | پلاندانێ | شیکاربکە | ساغبکەوە

شەماڵ مەڕەکانی ئامادەکرا بۆ پێشەنگای ساڵانەی کشتوکاڵی بۆ ئەم کارە هەفتانە ٢٥ کاتژمێر کاردەکات، بۆ ماوەی ٤ هەفتە. ئایا شەماڵ چەند کاتژمێر بۆ ئەم بۆنەیە کاردەکات؟



خشتەی خوارەوە یارمەتیدەدات بۆ هەڵبژاردنی کرداری گونجاو بۆ شیکارکردنی پرسیارەکە.

| | |
|---|---|
| کۆکردنەوە | • خستنە پاڵیەکتری کۆمەڵەکانی جۆراوجۆر. |
| لێدەرکردن | • وەرگرتن لە کۆمەڵە.<br>• بەراوردکردنی بڕەکان. |
| لێکدان | خستنە پاڵیەکتری کۆمەڵەکانی یەکسان. |
| دابەشکردن | • بەشکردنی کۆمەڵە بۆ چەند پارچەیەکی یەکسان.<br>• دۆزینەوەی ژمارەی دانەکانی هەر پارچەیەك. |

ئەگەر بتەوێت کۆمەڵەکانی یەکسان بخەیتە پاڵیەکتر، لێکدان بەکاربهێنە.

$4 \times 25 = 100$ یان $25 \times 4$

کەواتە، شەماڵ بۆ ئامادەکردنی مەڕەکانی دەبێت ١٠٠ کاتژمێر کاربکات.

**لەبیرمەکە** پێش ئەوەی پرسیارەکە شیکاربکەیت، دەبێ کرداری گونجاو دیاربکەی.

### باسبکە

- دەتوانی کام کرداری هەژمێرکردن بەکاربێنی بۆ شیکارکردنی پرسیارەکە؟ ڕوونیبکەرەوە.
- ئەگەر پێویست بوایە شەماڵ لە هەفتەی کۆتایی ٨ کاتژمێر زێدەتر کاربکات، وەڵامەکە چۆن دەبێت؟

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

**ئایا پێویستە کۆبکەیەوە یان لێکدەربکەی یان لێکبدەی یان دابەشبکەیت بۆ ئەوەی پرسیارەکە شیکاربکەیت؟**

١ سیروان لەهەر ڕۆژێکدا ٣٠ خولەکی پێویستە بۆ ڕاهێنانی ئەسپەکەی، چەند خولەکی لە ٥ ڕۆژدا پێویستە؟

٢ شیرین پارچە قوماشێکی هەبوو درێژییەکەی ١٢ مەتر و ٩٩ سەنتیمەتربوو، ١٠ مەتر و ٩٥ سەنتیمەتری لێکردە پەردە.
ئایا شیرین چەندی لە قوماشەکە ماوەتەوە؟

**هیوا ٣ خەڵاتی بۆ باوکی و دایکی و خوشکی کڕی، نرخی هەریەکێکیان ٧٥٠٠ دینار بوو، ئایا بەهای هەرسێ خەڵاتەکە چەندە؟**

٣ کرداری هەژماری گونجاو چییە بۆ شیکارکردنی پرسیارەکە.

أ ٧٥٠٠ + ٣
ب ٧٥٠٠ − ٣
ج ٣ × ٧٥٠٠
د ٧٥٠٠ ÷ ٣

٤ ئەو بڕە پارەیە چییە کە هیوا داویەتی؟

أ ٢٥٠٠ دینار
ب ٧٥٠٠ دینار
ج ١٥٠٠٠ دینار
د ٢٢٥٠٠ دینار

### ڕاهێنان لەسەر ڕێگا جیاوازەکان

**پێدراوەکانی خشتەکە بەکاربێنە بۆ شیکارکردنی پرسیارەکانی ٥ تا ٧.**

ئاژەڵەکانی ڕۆژی کشتوکاڵی

| ئاژەڵەکان | ژمارە |
|---|---|
| ئەسپ | ٦٠ |
| وشتر | ٥٥ |
| مەڕ | ٥٠ |
| کەروێشك | ٣٠ |

٥ ٦ کەروێشك فرۆشران و ئەوانی مانەوە بە یەکسانی بەسەر ٣ قەفەسدا دابەشکران. ژمارەی کەروێشکەکانی هەر قەفەسێك چەندە؟

٦ ئەسپەکان بەیەکسانی بەسەر ٦ کۆمەڵە دابەشکران، ژمارەی هەر کۆمەڵەیەك چەندە؟

٧ **ڕێنوێنی** وەڵام ١٠ پتر. کام کردار پێویستە بەکاربێنێت؟

# وانەی ٦

# تۆمارکردنی کرداری دابەشکردن



**پێداچوونەوەی خێرا**

١) $2\overline{)16}$ ٢) $6\overline{)48}$

٣) $5\overline{)25}$ ٤) $9\overline{)63}$

## فێربە

**لێکردنەوەی سێو** کارزان ٥٧ سێوی لە باخەکەی باوکی لێکردەوە، بە یەکسانی بەسەر ٣ سندوق بەشیکردن. چەند سێوی لەهەر سندوقێك دانا؟ چەند سێو لە دەرەوەی سندوقەکان ماوەتەوە؟



### نموونە ١

٥٧ ÷ ٣ = ▢ یان $3\overline{)57}$

**بخوێنەوە:** ٥٧ دابەش ٣ یان ٥٧ لەسەر ٣ **بنووسە:** $3\overline{)57}$

**هەنگاوی ١**

دەستبکە بە دابەشکردنی دەیان $3\overline{)5}$

**بیربکەوە:** ٣ × ١ = ٣



یەك دە لەهەر سندوقێك

**دابەشبکە** $3\overline{)5}$

**لێکبدە** ٣ × ١ = ٣

**دەربکە** ٥ − ٣ = ٢

**بەراوردبکە** ٢ < ٣

لێرە پێویستە جیاوازییەکە بیێتە (٢) بچووکترە لە بەشدراو (لێرە٣).

**هەنگاوی ٢**

پاش ئەوە حەوت یەکانەکە بێنە خوارەوە.

دوو دەیەکە خوردبکەوە بۆ یەکان ٢٧ یەکیت دەستدەکەوێت.

**هەنگاوی ٣**

ئێستا ٢٧ یەکی دابەشبکە $3\overline{)27}$ بیربکەوە ٣ × ٩ = ٢٧



٩ یەکی لەهەر سندوقێك

**دابەشبکە** $3\overline{)27}$

**لێکبدە** ٣ × ٩ = ٢٧

**دەربکە** ٢٧ − ٢٧ = ٠.

**هەنگاوی ٤**

لێکبدە بۆ ساغکردنەوەی وەلام

١٩ ← ئەنجامی دابەشکردن

× ٣ ← بەشدراو

٥٧

کەواتە، ژمارەی سێوەکان لەهەر سندوقێکدا (١٩).

## نموونە ٢

هێمن ٣٢ ئۆتۆمبێلی بچووکی هەیە دابەشیکردە سەر چەند کارتۆنێك لەهەر کارتۆنێکدا ٤ ئۆتۆمبێلی دانا. چەند کارتۆنی بەکارهێنا و چەند ئۆتۆمبێلی ماوە لە دەرەوەی کارتۆنەکان؟

٣٢ ÷ ٤ = ▭

**هەنگاوی ١**

لەبەر ئەوەی ژمارەی دەیەکان دەکاتە ٣ بەسەر ٤ دا دابەش نابێت، بە یەکان دەستپێبکە

▭
٤⟌٣٢

٤ > ٣ کەواتە ڕەنووسی یەکەمی ئەنجامی دابەش لە خانەی یەکەکان دابنێ

**هەنگاوی ٢**

٣٢ یەکان دابەش بکە بەسەر ٤

دابەش بکە ٤⟌٣٢

لێکبدە ٤ × ٨ = ٣٢

لێدەربکە ٣٢ - ٣٢ = ٠

```
  ٨
٤⟌٣٢
 -٣٢
   ٠
   ↑
  ماوە
```

**هەنگاوی ٣**

لێکبدە بۆ ساغکردنەوەی وەڵام

```
   ٨  ⟵ ئەنجامی دابەشکردن
 × ٤  ⟵ بەشراو
  ٣٢
```

کەواتە، هێمن ٨ کارتۆنی بەکارهێنا.

## نموونە

**أ**

```
  ١٤
٧⟌٩٨
 -٧
  ٢٨
 -٢٨
   ٠
```

ساغبکەرەوە

```
  ١٤
×  ٧
  ٩٨
```

**ب**

```
  ٢٢
٣⟌٦٦
 -٦
  ٠٦
  -٦
   ٠
```

ساغبکەرەوە

```
  ٢٢
×  ٣
  ٦٦
```



**لەبیرمەکە** هەنگاوەکانی تۆمارکردنی کرداری دابەشکردن بریتییە لە: دابەشبکە، لێکبدە، لێدەربکە، بەراوردبکە.

## ساغبکەوە

دابەشبکەو ساغبکەوە.

**١** ٤٥ ÷ ٥ = ▭　　**٢** ٤٢ ÷ ٣ = ▭　　**٣** ٦٦ ÷ ٦ = ▭

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

**٤** ٥⟌٧٠　　**٥** ٣⟌٦٦　　**٦** ٧⟌٩١

**٧** ٦⟌٩٦　　**٨** ٨⟌٩٦　　**٩** ٣⟌٣٩

ئایا لە دابەشکردندا بە دەیان دەستپێدەکەی یان بە یەکان؟ **بنووسە دەیان یان یەکان.**

**١٠** ٥⟌٢٥ **١١** ٦⟌٨٤ **١٢** ٣⟌١٥

**١٣** ٩⟌٧٢ **١٤** ٤⟌٣٦ **١٥** ٧⟌٦٣

**١٦** **هەڵە لە کوێدایە** کاروان کرداری دابەشکردن ٦٠ ÷ ٦ ئەنجامدا وەکو دیارە لە بەرامبەر. وەڵامی نووسی ١. لە کوێ کاروان هەڵەی کردووە؟

$$\begin{array}{r} ١ \\ ٦⟌٦٠ \\ -٦ \\ \hline ٠٠ \end{array}$$

## هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٧** ئەنجامی دابەشکردنی بەرامبەر کامەیە ٨⟌١٨٤ ؟

أ ٢٠ ب ٢٤ ج ٢٥ د ٢٣

## شیکارکردنی پرسیارەکان  ژمارەی خۆبەشەکان

١٦ چوارگۆشە بێنە. ئەو چوارگۆشانە بەکاربێنە بۆ پێکهێنانی چەند ڕیزکراویەکی هەمە جۆر.

١ × ١٦ = ١٦

٤ × ٤ = ١٦

٢ × ٨ = ١٦

٨ × ٢ = ١٦

١٦ × ١ = ١٦

ئەو ڕیزکراوانە ئەوە دیاردەکات کە ژمارەی ١٦ پێنج **کۆڵکەی** هەیە. ١، ٢، ٤، ٨، ١٦.

ئێستا ٧ چوارگۆشە بەکاربێنە. دەتوانی تەنها دوو ڕیزکراو پێکبێنی، بەبەکارهێنانی ئەو حەوت چوار گۆشەیە.

ژمارەی ٧ **ژمارەیەکی خۆبەشە**، چونکە تەنها دوو کۆڵکەی جیاوازی هەیە، ئەویش یەك و ژمارەکە خۆی.

١ × ٧ = ٧

٧ × ١ = ٧

ژمارەی ١٦ خۆبەش نییە، چونکە لە دوو کۆڵکە زیاتری هەیە، ئەوە **ژمارەیەکی دابەشە**.

**چوارگۆشە بچووکەکان بەکاربهێنە. ڕیزکراوەکان دروستبکە بۆ دیارکردنی کۆڵکەی ژمارەکان، ئایا ژمارەکە خۆبەشە یان دابەشە؟**

أ ٦ ب ٣ ج ١٥ د ٢٠ هـ ١٣

وانەی ٧

# ڕاهێنان لەسەر دابەشکردن



## پێداچوونەوەی خێرا

١ ١٢ ÷ ٢ = ▢

٢ ٢١ ÷ ٣ = ▢

٣ ١٢ ÷ ٤ = ▢

٤ ٥٤ ÷ ٦ = ▢

## فێربە

**زۆرترین یاری چییە؟** ڕازاو ٨٤ یاری هەیە. بە یەکسانی دابەشیکردن بەسەر ٦ ڕەفەدا لە ژوورەکەیدا، هەرڕەفەی چەند یاری لەسەر دانا؟ چەند یاری مایەوە کە لەسەر ڕەفەکە دانەنرابوو؟

### نموونە ١

٨٤ ÷ ٦ = ▢ ‏ ٦⟌٨٤

**بخوێنە:** ٨٤ دابەش ٦ یان ٨٤ لەسەر ٦ ‏ **بنووسە:** ٦⟌٨٤

**هەنگاوی ١**

یەکەم جار بەسەر ٦ دابەشبکە.

٦⟌٨٤ ← ١، ٨٤ − ٦ = ٢

٦⟌٨

٦ × ١ = ٦

٨ − ٦ = ٢

٢ < ٦

**هەنگاوی ٢**

٤ یەکان دێنمە خوارەوە ٢٤ بەسەر ٦ دابەشبکە.

٦⟌٨٤ ← ١٤، − ٦، ٢٤، − ٢٤، ٠

**دابەشبکە** ٦⟌٢٤

**لێکبدە** ٦ × ٤ = ٢٤

**لێدەربکە** ٢٤ − ٢٤ = ٠

**هەنگاوی ٣**

لێکبدە بۆ ساغکردنەوەی وەڵام.

١٤ ← ئەنجامی دابەش

× ٦ ← بەشراو

٨٤

• ئایا دەتوانێت ١ لەسەر خانەی یەکان بنووسی لە هەنگاوی ١؟

## ساغبکەوە

١ ڕوونیبکەوە بۆ دەبێت ٦ × ٤ لێکبدەی لە هەنگاوی ٢؟

دابەشبکە.

٢ ٣٩ ÷ ٣ = ▢ ‏ ٣ ٣٦ ÷ ٢ = ▢

## ◀ ڕاهێنـــان و شیـکـارکــردنـی پـرسـیـارەکـان

دابەشبکە.

٤ ▢ = ٢ ÷ ٢٦

٥ ▢ = ٣ ÷ ٤٨

٦ ٦⟌٦٦

٧ ٤⟌٦٤

٨ ٣⟌٨١

٩ ٩⟌٧٢

دابەشبکە و ساغبکەوە.

١٠ ▢ = ٨ ÷ ٧٢

١١ ▢ = ٢ ÷ ٧٨

١٢ ٥⟌٧٥

١٣ ٤⟌٧٦

١٤ ٤⟌٥٢

١٥ ٣⟌٦٣

١٦ ▢ = ٥ ÷ ٤٥

١٧ ▢ = ٣ ÷ ٤٥

هەنگاوەکانی ساغکردنەوە بنووسە بۆ کرداری دابەشکردن.

١٨ ٢٤ = ٤ ÷ ٩٦

١٩ ١٩ = ٤ ÷ ٧٦

٢٠ **ئەژمێرکردنی هزری** چۆن ڕاستی دابەشکردنی ٢٠ ÷ ٥ = ٤ بەکاردەهێنی بۆ دابەشکردنی ٢٥ ÷ ٥ بە هزری؟

٢١ 

سۆما ١٢٨ شەکرۆکەی پێیە دابەشیکرد بە یەکسانی بەسەر ٤ لە هاوڕێیەکانی. ڕستەیەکی ژمارەیی بنووسە بۆ ئەژمێرکردنی هەر یەکە لە هاوڕێیەکانی چەند شەکرۆکەی وەرگرتووە.

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

٢٢ ئەنجامی دابەشکردنی بەرامبەر کامەیە؟ ٥⟌٩٣٥

أ ١٠٥ ب ١٨٠ ج ١٨٥ د ١٨٧



## پێداچوونەوەی خێرا

١ ١٨ ÷ ٣ = ▢

٢ ٢٤ ÷ ٨ = ▢

٣ ٤٢ ÷ ٦ = ▢

٤ چەند ٦ هەیە لە ٣٦؟

وانەی ٨

# دابەشکردنی ژمارەیەك بەسەر ژمارەیەکی یەك ڕەنووسی

### فێربە

**پۆلی سێیەم** لە قوتابخانەکەماندا ٦ پۆل هەیە. لە پۆلی یەکەم تا پۆلی شەشەم. ژمارەی قوتابیان لە قوتابخانەکە ١٩٢ قوتابییە هەموو پۆلەکان هەمان ژمارەی قوتابیانی هەیە. ژمارەی قوتابیانی پۆلی سێیەم چەندە؟



بۆ ئەوەی ژمارەی قوتابیانی پۆلی سێیەم بزانیت پێویستە ژمارەی قوتابیانی قوتابخانە، ١٩٢، دابەشی ژمارەی ٦ پۆلەکە بکەیت، چونکە هەموو پۆلەکان هەمان ژمارە قوتابیانی هەیە.

### نموونە

**دابەشبکە:** ١٩٢ ÷ ٦ = ▢ **یان** ٦⟌١٩٢

**هەنگاوی ١**

یەکەم دیاربکە ڕەنووسی یەکەم لە کوێ دادەنێی لە ئەنجامی دابەشکردنەکە.

٦⟌١٩٢ ١ < ٦،

٦⟌١٩٢ ١٩ > ٦،

**هەنگاوی ٢**

١٩ دابەشبکە سەر ٦.

٣
٦⟌١٩٢ لێکبدە
-١٨ لێدەربکە
١
بەراوردبکە ١ < ٦

دەبێت جیاوازی بچووکتر بێت لە بەشدراو.

**هەنگاوی ٣**

ڕەنووسی یەکانی ٢ بێنە خوارەوە تا ١٢ یەکانت دەستدەکەوێت بۆ دابەشکردن بەسەر ٦.

٣٢
٦⟌١٩٢ لێکبدە
-١٨↓ لێدەربکە
١٢
-١٢
٠
بەراوردبکە ٠ < ٦

لە کۆتاییدا ژمارەی قوتابیانی پۆلی سێیەم دەبێتە ٣٢ قوتابی.

- چۆن لێکدان بەکاردێنی بۆ دڵنیابوون لە وەڵامەکەت؟



**لەبیرمەکە** کاتێك دابەشکردن دەکەیت پێویستە بزانی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردن لەکوێ دادەنرێت؟



## ساغبکەوە

**١** ڕوونیبکەوە پێویستە بزانی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردن لە کوێ دادەنرێت؟

**بینووسەرەوە. نیشانەی ✳ لە شوێنی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردنەکە دابنێ.**

**٢** ٥⟌٦٥ **٣** ٣⟌٣٢٤ **٤** ٤⟌٥٦

## ڕاهێنان و شیکارکردنی پرسیارەکان

**کۆپیبکە. نیشانەی ✳ لە شوێنی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردنەکە دابنێ.**

**٥** ٤⟌٩٢ **٦** ٨⟌١٠٤ **٧** ٦⟌٦٥٠

**دابەشبکە.**

**٨** ٥⟌١٥٥ **٩** ٣⟌٨٤

**١٠** ٨⟌٦٨٠ **١١** ٧⟌٢٩٤

**١٢** ٣⟌٧٢ **١٣** ٩⟌٨١٩

**١٤** ٧⟌١٥٤ **١٥** ٥⟌٩٠

**١٦** **پرسیارێك بنووسە** بەشکراو لە ٣ ڕەنووس پێك بێت، ڕەنووسی یەکەمی ئەنجامی دابەشکردن لە خانەی دەیان بێت.

**١٧** ئازاد ٢٦٧ی دابەشکرد بەسەر ژمارەیەك، ڕەنووسی یەکەمی ئەنجامی دابەشکردنی لە خانەی دەیان نووسی. بەهاکانی توانراو بۆ بەشدراو چییە؟

**١٨** کاروان ٢٣٥٠ دیناری هەیە و سامان ١٢٥٠ دیناری هەیە. هەردوو هاوڕێ چەند دیناریان هەیە؟

### هەڵبژاردن لە هەمەجۆر

**١٩** ئەنجامی دابەشکردنی بەرامبەر کامەیە؟ ٧⟌١٨٩

أ ٢٧ ب ٢١ ج ٢٤ د ٢٥

# بەشی ٩

# پێداچوونەوە

## دڵنیابوون لە هەبوونی چەمکەکان

ڕیزکراوەکە بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان.

**١**



٢ × ٧ = ١٤ ٢ × ١٠ = ٢٠

٢ × ١٧ = ▢

**٢**



٥ ڕیز لە ٣ ٥ ڕیز لە ١٠

٥ × ٣ = ١٥ ٥ × ١٠ = ٥٠

٥ × ١٣ = ▢

تەواو بکە.

**٣**
٦ × ١ = ▢
٦ × ١٠ = ▢
٦ × ١٠٠ = ▢
٦ × ١٠٠٠ = ▢

**٤**
٥ × ٣ = ▢
٥ × ٣٠ = ▢
٥ × ٣٠٠ = ▢
٥ × ٣٠٠٠ = ▢

## دڵنیابوون لە کارامەییەکان

لێکبدە.

**٥** ١٤ × ٢

**٦** ٢٧ × ٣

**٧** ٣٦ × ٦

**٨** ٢٠ × ٤

دابەشبکە.

**٩** ٢١ ÷ ٣ = ▢

**١٠** ٣٤ ÷ ٢ = ▢

**١١** ٢⟌٥٤

**١٢** ٤⟌٧٢

**١٣** ٥⟌٦٥

**١٤** ٣⟌٩٦

**١٥** ٦⟌٣٦٠

**١٦** ٨⟌٣١٢

**١٧** ٤⟌٢٥٢

**١٨** ٩⟌٧٤٧

## دڵنیابوون لە شیکارکردنی پرسیارەکان

**١٩** ٣٦ قوتابی چوونە مۆزەخانە. ئایا پێویستیان بە چەند پاس بووە ئەگەر پاسێك ٩ قوتابی بگرێت؟

**٢٠** ئەندازیارێك پێویستی بە چەند پارچە ئاسنێك هەیە درێژی هەر یەکێکیان ٤ مەترە. ئایا دەتوانێت چەند پارچە دروستبکات ئەگەر ٥٦ مەتر ئاسنی هەبێت.

بەشی ٩

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**ئاگاداربە!**

- هەموو ناوەڕۆکەکە بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت لە پرسیار.
- وەڵامەکانت ساغبکەوە.

**وەڵامی گونجاو دەوربدە لە ڕاهێنانی ١ تا ١١.**

**١** ٥٧ × ٧ = ▢

أ ٦٤ ‏ ب ٣٤٩ ‏ ج ٣٨٩ ‏ د هیچ لەوان

**٢** شوان ئارەزووی کۆکردنەوەی گوێچکە ماسی دەریایی هەیە. ١٩ گوێچکەی گەورە و ٣٧ ناوەنجی و ٥٤ بچووکی کۆکردەوە. چەند گوێچکەماسی کۆکردۆتەوە؟

أ ٩٠ ‏ ب ١٠٠ ‏ ج ١١٠ ‏ د ١٢٠

**٣** محەمەد ١٢ سێو لە هەفتەیەك دەخوات. چەند سێو لە ٨ هەفتە دەخوات؟

أ ٢٠ ‏ ب ٥٦ ‏ ج ٩٦ ‏ د ١٠٦

**٤** ٩٥٢ × ٩ = ▢

أ ٢ ٣٦٨ ‏ ب ٨ ٥٦٨ ‏ ج ٢ ٢٥٨ ‏ د ٢ ٢٥٠

**٥** ١٤٥٦ نزیکەی چەندە بۆ نزیکترین ١٠٠؟

أ ٢ ٠٠٠ ‏ ب ١ ٥٠٠ ‏ ج ١ ٤٠٠ ‏ د ١ ٠٠٠

**٦** ٨⟌٩٦

أ ١٠ ‏ ب ١٣ ‏ ج ١١ ‏ د ١٢

**٧** ٤٨ قوتابی چوون بۆ مۆزەخانە چەند ئۆتۆمبێلیان پێویستە ئەگەر ئۆتۆمبێلێك ٤ قوتابی بگرێت؟

أ ٧ ‏ ب ١٠ ‏ ج ١١ ‏ د ١٢

**٨** ناوی ئەم تەنە ئەندازەییە بڵێ؟



أ شەشپاڵوو ‏ ب قووچەك ‏ ج هەرەم ‏ د گۆ

**٩** ٧⟌٩٤٥

أ ١٣٥ ‏ ب ١٤٥ ‏ ج ١٤٩ ‏ د هیچ لەوان

**١٠** ٢٢٨ ÷ ٤ = ▢

أ ٧٢ ‏ ب ٦٨ ‏ ج ٤٨ ‏ د ٥٧

**١١** لە فرۆکەیەکدا ١٤٠ کورسی لە چەند ڕیزێکدا بەشکراون. ژمارەی کورسییەکانی هەر ڕیزێك بریتییە لە ٤ کورسی، ژمارەی ڕیزەکان چەندە؟

أ ٣٥ ‏ ب ٤٠ ‏ ج ٦٠ ‏ د ٥٦٠

## ئەوەی دەیزانی بینووسە

**١٢** لاوین چەند چوارگۆشەیەکی بەکارهێنا بۆ پێکهێنانی ڕیزکراوەیەکی ٣ ڕیزی ١٨ ستوونی. وێنەیەکی ئەم ڕیزکراوە بکێشە و ڕستەیەکی ژمارەیی بنووسە بۆ هەژمارکردنی چوارگۆشەکان.

**١٣** هەنگاوەکان دیاریکە بۆ هەژمارکردنی.

٤٢ × ٩ = ▢